زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان | 23

# گەنج و هەست و هەڵوێست








2022 - 1443

عەلی باپیر

**گەنج و هەست و هەڵوێست**

**نووسین: عـــەلی بـــاپیر**



چاپی یەکەم ١٤٤٣ز - ٢٠٢٢ك




**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
عــەلی بــاپیر (نووسەر)
گەنج و هەست و هەڵوێست
١٦٢ لاپــەڕە
١٤ * ٢١ سـم
بابـەت : ئایینی
ISBN : 978-9922-654-91-1
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی (٤٧) ی ساڵی ٢٠٢٢ پێدراوە



**خـەتی بـەرگ :** نـــەوزاد کۆیـــی
**دیزاینی ناوەوە :** زەردەشت کاوانی

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿إِنَّهُمۡ فِتۡيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمۡ وَزِدۡنَٰهُمۡ هُدٗى ١٣ وَرَبَطۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ إِذۡ قَامُواْ فَقَالُواْ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَن نَّدۡعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهٗاۖ لَّقَدۡ قُلۡنَآ إِذٗا شَطَطًا ١٤﴾

الكهف: ١٣-١٤



## پێشکەش بێ

• بەو بەرپرسانەی گەنج و لاوانی وڵاتەکەیان وەك کوڕو کچەکانی خۆیان تەماشا دەکەن و، دڵسۆزانە هۆکارو ئامڕازەکانی تێگەیشتن و پێگەیشتنیان بۆ دابین دەکەن.

• بەو گەنج و لاوانەی بەرانبەر بەستەم و گەندەڵیی و لادان و تاوانی کۆمەڵگایەکەیان، دەستەوئەژنۆ دانامێنن و، بەهیچ نرخێك دەست لەپاکسازیی و چاکسازیی تێداکردنی هەڵناگرن و، لەژێر هیچ فشارێکیشدا بەجێی ناهێڵن و، بۆ کەمینەیەکی خۆسەپێنی خۆشگوزەران وازی لێ ناهێنن.



## پێشەکیی و ڕێ خۆشکردن

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

**إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.**

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ **آل عمران.**

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ **النساء.**

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ **الأحزاب.**

أمــا بعـــــد:

فإن أصدق الحديث كتاب الله، وأحسن الهدي هدي محمد صلى الله عليه وسلم، وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار.

خوێنەری بەڕێز!

بارودۆخی ئێستای هەرێمی کوردستان لە کەس شێرراوە نیە، کە ستەم و بێدادییەکی بێ ڕەزا تێیدا بڵاوەو پەرەی ستاندوە، بەجۆرێك کە بۆتە مایەی تەشەنەکردنی نیگەرانییو بێزارییەکی زۆری گشتیی و، تووڕەیی و خەشم و قینی زۆرێك لە خەڵکیش.

شتێکی ئاشکراشە کە لە هەموو کۆمەڵگایەکدا، چینی گەنج و تازە پێگەیشتوو هەستیارترین توێژنو بە گشتیی لە توێژەکانی دیکە زووتر و زیاتر هەست بە خێر و شەڕ و خۆشیی و ناخۆشییەکان دەکەن و، کاردانەوەشیان خێراتر دەبێ.

هەربۆیەش گەنج و لاوان، ئەگەری زیاتری هەیە لەبەر زێدە هەستیاریی و سۆزو هەڵچوون، تووشی کاردانەوەی هەڵە و تێپەڕاندن بین، لە کاتێکدا دەیانەوێ بارودۆخی نەخوازراوی کۆمەڵگایەکەیان بگۆڕن و چاکی بکەن.

ئنجا ئەم بەرهەمە هەوڵێکی بەندەیە، بۆ ڕێنمایی کردن و بەرچاوڕوونکردنەوەی گەنج و لاوەکانمان، کە پێویستە (هەست و هەڵوێست)یان لەم واقیعەی ئێستاماندا چۆن بێ؟!

هەروەها باسی هەندێك لە گیر و گرفتەكانی گەنج و لاوەكانمان و چۆنیەتی چارەسەر كردنیشیانمان كردوە، بگرە ئەو باسە پشكی شێری ئەم بەرهەمەی پێبڕاوە.

شایانی باسە:

ئەم بەرهەمە لە ئەسڵدا وتارێك[١] بووە بە هەمان ناوونیشان و، پاش هێنرانیە سەر كاغەز و دەستكاریی كردنێكی زۆری خۆم[٢]، بەو شێوەیەی لێهاتوە، كە ئومێدم وایە بەرچاو ڕوونیی و ڕێ پێشاندانێكی باشی تێدابێ، بە تاییەت بۆ گەنج و لاوەكانمان و، بە گشتیی بۆ هەموو لایەك.

باس و بابەتەكانی ئەم بەرهەمەش ئەمانەن:

(دەستپێك) كە تێیدا ناوونیشانی بابەتەكە: گەنج و هەست و هەڵوێست، شی دەكەینەوە و تیشك دەخەینە سەر هەركام لە: گەنج، هەست، هەڵوێست، بە تاییەت پێناسەیەكی گەنج و، گرنگترین تاییەتمەندییەكانی دەكەین.

تەوەری یەكەم: گرنگیی قۆناغی گەنجێتی لە مێژوو و لە واقیعی ئێستامانداو، لە ڕوانگەی قورئان و سوننەتەوە.

لە دوو برگەدا ئەم تەوەرە دەخەینەڕوو و، باسی گرنگیی قۆناغی

---

(١) لە ڕۆژی ٢٠٢١/١٠/١ ز لە شاری ڕانیە، دراوە.

(٢) لە وكاتەدا لە شاری بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیا بووم

گەنجێتیی دەکەین لە مێژووداو، لە قورئان و سوننەتدا.

تەوەری دووەم: هەست و هەڵوێستی گەنج لە واقیعی ئێستادا.

لە حەوت بڕگەدا باسی هەست و هەڵوێستی گەنج و لاو دەکەین، هەوڵمانداوە زۆربەی ڕەهەندە گرنگەکانیان تێدا بخەینە ڕوو، کە پێویستە گەنج و لاوەکانمان هەست و هەڵوێستی ڕاست و دروستیان هەبێ.

تەوەری سێیەم: هەندێك لە گیروگرفتەکانی گەنج و لاو لە هەرێمی کوردستانداو چارەسەریان.

ئەم تەوەرەش لە دوو بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

بڕگەی یەکەم: هەندێك لە گیرو گرفتەکانی گەنج و لاو لە هەرێمی کوردستاندا.

کە لە دە (١٠) خاڵاندا ئەو گیرو گرفتانەمان خستوونەڕوو.

بڕگەی دووەم: چارەسەری هەندێك لە گیرو گرفتەکانی گەنج لە هەرێمی کوردستاندا.

ئەم بڕگەیەشمان لە دوو خاڵی سەرەکییدا خستۆتەڕوو:

خاڵی یەکەم: لەسەر ئاستی قەوارەی سیاسی، کە لە پێنج بەندا ئەرکی قەوارەی سیاسیی و حکوومەت دەخەینەڕوو.

خاڵی دووەم: لەسەر ئاستی خودی گەنج و لاوەکانمان، لەم خاڵەشدا

لە پێنج بەنددا، پێنج ئەرکی گرنگی خودی گەنج و لاوەکانمان بۆ چارەسەری گیروگرفتەکانیان و پارێزراوییان لێیان، دەخەینە ڕوو.

١٧ی جەمادی یەکەم ١٤٤٣ك

٢٠٢١/١٢/٢١ز

ئەڵمانیا / بەرلین



بەڕێـــزان!

بابەتەکەمان ناوونیشانەکەی: (گەنج و هەست و هەڵوێست)ە، سەرەتاش وەك دەستپێك دەڵێم: هەمووڵایەکتان، بە گەنج و بە پیرو وردو درشتەوە، ئەم واقیع و هەل و مەرجە سەختەی کە هەرێمی کوردستانی تێدایەو، خەڵکی هەرێمی کوردستانی پێدا گوزەر دەکات، دەیبینن، کە بەڕاستیی واقیعێك و هەل و مەرجێکە، جێی ئەوەیە وەك پێویست هەستی پێبکەن و، دەرکی پێبکەن، بەڵام وێڕای هەستپێکردن و ناسینی، هەڵوێستیشی لێ وەربگرن، بۆیەش بابەتەکەم لە ژێر ناوونیشانی ئەو سێ موفرەدەیەدا پێشکەش دەکەم: گەنج و هەست و هەڵوێست.

شیکردنەوەی ناوونیشان:

سەرەتا پێویستە کەمێك ناو و نیشانی بابەتەکەتان بۆ شیی بکەمەوە.

مەبەستمان لە گەنج و هەست و هەڵوێست چییە؟!

بێگومان کۆمەڵگا زیندووەکان، ئەو کۆمەڵگایانەی دەتوانن بەردەوام بن، بگرە بەرەو پێشەوەش بچن، ئەوانەن کە چینی تازە پێگەیشتوو تێیاندا خاوەنی هەست و شعوورێکی ڕاستبێ و، واقیعەکە وەك خۆی دەرك بکات و، خاوەنی هەڵوێستێکی پڕ بە پێستی ئەو هەست و شعوورەشبێ.

ئێستاش با کەمێك هەرکام لەو وشانە: گەنج، هەست، هەڵوێست شی بکەینەوە:

یەکــەم: گەنـــج

لەلای زۆربەی زانـــایـــانی کۆمـــەڵناس، قۆناغی گەنجێتیی (مرحلة الشباب) لەپازدە (١٥) ساڵییەوە دەست پێدەکات ڕەنگە بۆ کچانی گەنج، یەك دوو ساڵ پێشتریش دەست پێبکات، هەتا بیست و پێنج (٢٥) ساڵیی، لەلای ژمارەیەکی زۆر لە کۆمەڵناسان و، هەندێکیشیان دەیگەیەننە سیی (٣٠) و، بەڵکو هەندێکیان دەیگەیەننە سی و پێنج (٣٥) و، هەندێکیان دەیگەیەننە چل (٤٠) یش، بەڵام زۆربەیان پازدە تاکو بیست و پێنج (١٥ – ٢٥) بە تەمەنی گەنجێتیی و لاوێتیی دادەنێن.

بەڕێزان! قۆناغی گەنجێتیی گەنجینەیەکە لە تەمەنی مرۆڤدا، ئەگەر خوا هیدایەتی بدات و کار ئاسانیی بۆ بکات، لەسەرەتای تەمەنیەوە، لە قۆناغی گەنجێتییەوە کە دەست پێدەکات، بەباشی بیهێنێ، زۆر بەختەوەرتر دەبێ لەوەی چەند ساڵێك بەسەرگەردانیی بیگوزەرێنێو دواتر بگەڕێتەوە، چونکە کەسایەتیی مرۆڤ لەو قۆناغەدا بنیات دەنرێ، هەڵبەتە لە قۆناغی پێشتریشدا، کە ئەوە زیاتر ئەرکی باب و دایکەو ئەرکی کۆمەڵگایەو، ئەرکی قوتابخانەیەو، ئەرکی ئەو نێوەندانەیە کە دەبێ وەچەی تازەمان بۆ پێبگەیەنن، بەڵام لەوکاتەوە کە مرۆڤ باڵغ دەبێ لە پازدە (١٥) ساڵیی بەرەو

دوا، کە ئەرکی شەرعیی دەکەوێتە سەر خۆی، لەوێوە بنیاتنانی کەسایەتیی بەدەستی مرۆڤ خۆی دەستپێدەکات.

ئەو تایبەتمەندییانەش کە لەو قۆناغە گرنگ و هەستیارەی تەمەنی مرۆڤدا هەن، زۆرن، بەڵام ڕەنگە زەقترینیان ئەمانەبن:

١- گەنج لە هەموو پێکهاتەو توێژەکانی دیکەی کۆمەڵگا، زیاتر ئامادەیی هەیە بۆ گۆڕانکاریی، بۆ وەرگرتنی شتی تازە، نەك هەر بەباری خێردا، بەڵکو خوا نەکردە، بەباری شەڕیشدا.

٢- گەنج لە قۆناغی گەنجێتیی و لاوێتییدا، سوورە لەسەر ئەوەی داخوازییەکانی خۆی جێبەجێ بکات و، بە حەماسەت و دڵگەرمییەوە، بەرەو جێ بەجێ کردنی خولیاو ئاواتەکانی دەچێت، هەروەها گەنج بۆ داهاتوو دەڕوانێ و خاوەنی ئامانج و خولیایەو، هەندێك جاریش خاوەنی خەیاڵ و ئەندێشەیەکە، دەیەوێ پێی بگات لە داهاتوویدا.

٣- قۆناغی گەنجێتیی، مرۆڤ تێیدا زۆر سوورە لەسەر وەرگرتنی زانست، لەسەر کەشفکردنی شتی شێرراوە و نەزاندراو، بەنسبەت گەنجانەوە بە گشتیی هەر وایە، بگرە حاڵەتی ئاسایی و سرووشتیی مرۆڤانەو، هەموو مرۆڤێك کە چاو دەکاتەوەو دنیا دەبینێ و، خۆی دەناسێ و دەوروبەری دەناسێ، دەیەوێ زیاتر شارەزای خۆی بێ و، شارەزای دەوروبەربێ، شارەزای گەردوون بێ، شارەزای هەموو شتێك بێ.

٤- یەكی دیكە لە تایبەتمەندیەكانی گەنج ئەوەیە، گەنج حەزدەكات خودی خۆی بچەسپێنێت، واتە بوونی خۆی لە واقیعدا بەرجەستە بكات، ڕازی نابێ بخرێتە پەڕاوێزەوە، بەڵام بە مەرجێك حاڵەتی سرووشتیی و ئاسایی مابێ و، حاڵەتە زگماكییەكەی لەدەست نەدابێ، گەنج دەیەوێ بوونی خۆی بچەسپێنێ لە واقیعدا.

٥- تایبەتمەندییەكی دیكەی گەنج ئەوەیە: كە هەمیشە گەنج ڕەخنە دەگرێ لە واقیعێك كە بەدڵی نەبێ، ڕەخنەی لێ دەگرێ و لەگەڵی دا ڕووبەڕوو دەبێتەوە، بەرەنگاری دەبێتەوەو دەیەوێ بیگۆڕێ و، بەو شێوەی لێبكات كە دڵپەسەندی خۆیەتی.

٦- تایبەتمەندییەكی دیكەی گەنج ئەوەیە كە فشارو زەخت قبووڵ ناكات، قبووڵ ناكات ناچار بكرێ و زۆری لێبكرێ، بۆیە پێویستە بەتایبەت لە تەمەنی هەرزەكارییدا، واتە پێش ئەوەی مرۆڤ بچێتە نێو قۆناغی گەنجێتییەوە، دەبێ باب و دایكەكان، زۆر وەستایانە لەگەڵ منداڵەكانیاندا مامەڵە بكەن، زۆریان لێ نەكەن، فشاریان بۆ نەهێنن، بەڵكو هەوڵبدەن تێیان بگەیەنن، لەباتی ئەوەی بەزۆر شتێكیان پێبكەن، هەوڵبدەن قەناعەتیان پێ بێنن و لێیان حاڵیی ببن و حاڵییشیان بكەن.

٧- تایبەتمەندییەكی دیكەی گەنج ئەوەیە كە بە خێرایی بڕیار دەدات و، بەخێرایی كاری تێدەكرێ، بە هەردوو باری خێرو شەڕدا و، زووتر دەكەوێتە ژێر كاریگەریی.

٨- تایەبتمەندییەکی دیکەی گەنج ئەوەیە زیاتر حاڵەتی دڵ گەرمیی و حەماسەت و سۆزی بەسەردا زاڵە، هەڵبەتە ئەوەش بەومانایە نیە عەقڵ و هۆشیشی بەکار ناهێنیٚ! بەڵام دوایی وردە وردە کە دەکەوێتە تەمەنەوە، ئەوجار ئەو حاڵەتی سۆزو هەڵچوونە کەمتردەبێتەوەو، حاڵەتی عەقڵ و دانایی بەخۆوە دەگریٚ.

٩- تایبەتمەندییەکی دیکەی گەنج ئەوەیە کە حەز لە سەرکێشیی و سەرەڕۆیی و یاخیبوون و خۆ پێدادان دەکات.

ئەوانە چەند تایبەتمەندییەکی گەنجن و پتر پێناسەی گەنجان بۆ دەکەن.

دووەم: هــەســت:

وشەی هەست بە عەرەبیی دەبێتە (شعور)، ئنجا هەم وشەی (شعور) لە زمانی عەرەبییدا (شعر یشعر شعوراً) هەم وشەی هەست لە فەرهەنگەکانی کوردییدا، مانایەکەیان بریتیە لە دەرککردن و زانین.

هەندێك جار وادەزانریٚ کە دەگوتریٚ: هەستم پێکرد، واتە: بە پێنج هەستەکان دەرکم کرد، بەڵام لە ڕاستییدا هەست هەم بە پێنج هەستەکان و، هەم بە عەقڵ و لێکدانەوە، بەخورپە و فیترەت و ناخ، بە هەموو ئەو ڕێباز و شێوانەی کە مرۆڤ دەتوانیٚ لەگەڵ واقیعدا مامەڵە بکات و دەرکی بکات و بیزانیٚ، هەمووی پێی دەگوتریٚ هەست.

سێیەم: هــەڵوێســـت:

مەبەستمان لە هەڵوێست ئەوەیە، کە مرۆڤ دوای ئەوەی هەستی بە شتێك کرد، دەبێ هەڵوێستی لەبەرانبەردا وەربگرێ، ئەگەرنا هەستکردنەکەی چووەتە هیچ و، بۆتە شتێکی بێ کەڵك و پووچ.

هەمیشە دەبێ زانین بگۆڕدرێ بۆ توانین و، حاڵیی بوون دەبێ بکرێتە حاڵ و، شارەزابوون دەبێ بگۆڕدرێ بۆ کارا بوون، ئەگەرنا زانیاریی تەنیا و شارەزایی ڕووت، ئەگەر کارایی و کردەوەو توانینی لێ نەکەوێتەوەو، حاڵیی بوون ئەگەر نەگۆڕدرێ بۆ حاڵ و سیفەت و کردار، خاوەنەکەی پێی ناگات بە هیچ.

هەڵبەتە هەڵوێست هەمیشە لە قەدەر هەستەو، کاتێك مرۆڤ دەتوانێ هەڵوێستێکی ڕاست و دروستی بێ، کە هەستێکی ڕاست و دروستی بێ، بۆیە زانایانی کۆمەڵناس دەڵێن: هەموو تەسەڕوفێك، (هەڵس و کەوتێك) ڕیشەکەی و بناغەکەی، بریتیە لە تەسەووڕێك (وێناکردنێك) ئەگەر وێنا کردن و تێگەیشتنت ڕاست و دروست نەبێ، بە دڵنیایی هەڵوێست نواندنەکەیشت ڕاست و دروست نابێ.

ئەوەی ڕابردوو وەك پێناسەی ناو و نیشانەکە بوو.

ئنجا کۆی بابەتەکە لە سێ تەوەردا پێشکەشی ئێوەی بەڕێزی دەکەم.

تەوەری یەکەم: گرنگیی قۆناغی گەنجێتیی لە مێژوو و واقیعی ئێستاداو، لە ڕوانگەی قورئان و سوننەتەوە.

تەوەری دووەم: هەست و هەڵوێستی گەنج لە واقیعی ئێستادا.

تەوەری سێیەم: هەندێك لە گرفت و كێشەكانی گەنج لە هەرێمی كوردستانداو، چارەسەریان.



www.alibapir.com

تەوەری یەکەم

# گرنگیی قۆناغی گەنجێتیی لە مێژوو و لە واقیعی ئێستاماندا و لە ڕوانگەی قورئـــان و سوننەتەوە



بە پشتیوانیی خوا، لە دوو بڕگەدا باسی گرنگیی قۆناغی گەنجێتیی دەکەین:

یەك: لە مێـژوودا:

بەڕێزان! قۆناغی گەنجێتیی ئەگەر تەماشای مێژووی هەموو میللەتان بکەین، بەبێ هەڵاواردن، هەمیشە ئەو گۆڕانکارییانەی بوون لە کۆمەڵگاکاندا، بە درێژایی مێژوو، چینی گەنج پشکی شێریان تێیاندا پێ براوە، بێگومان چینی کامڵ و بەساڵدا چووش پێویستن، بەڵام ئەوان بۆ نەخشە دانان و تەگبیر کردن زیاتر، بەڵام کێ دەبێتە ئامێری جێبەجێکردن و گۆڕانکاریی بە کردار؟! زیاتر چینی گەنج! لەبەر ئەوەی خاوەنی وزەو توانایەکی ڕووحیی و فیکریی و جەستەیی و عاتیفیی زۆرن.

ئەگەر تەماشای مێژوو بکەین، ئەوە ڕاستییەکی ڕوون و بێ چەندووچوونە، بەڵام ئێستا دەرفەت نیە هەندێك لە گۆڕانکارییەکانی کە لەمێژوودا بوون بە نموونە بیانهێنمەوە، بەڵام با سەرنجێکی مێژووی پێغەمبەری خاتەم (محمد) "صلى الله عليه وسلم" بدەین کە خۆی کاتێك خوا هەڵییدەبژێرێ بە پێغەمبەر، تەمەنی چل (٤٠) ساڵە، واتە تازە قۆناغی گەنجێتیی تێپەڕاندوەو چووەتە نێو قۆناغی کامڵ بوونەوە، هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەریش "صلى الله عليه وسلم" خوا لێیان ڕازی بێ هەموویان لە خۆی کەم

تەمەنتر بوون، ئەوەی لە هەموویان بەتەمەنتر بوو، لە هاوەڵان، لە کاتی سەرەتادا بەتایبەت، ئەبووبەکری صیددیق بوو، کە تەمەنی سی و حەوت (٣٧) ساڵ یان سی و هەشت (٣٨) ساڵ، دوو سێ ساڵ لە پێغەمبەری خاتەم "علیه الصلاة والسلام" تەمەنی کەمتر بووە، ئەوانی دیکە هەموویان لە تەمەنی پازدەو شازدەو حەڤدە، تاکو بیست و بیست و پێنج و سیی ساڵیی بوون.

بۆیەش لە شوێنەوارێکدا هاتوە، و پاڵدراوەتە لای پێغەمبەریش، هەرچەندە لە ڕووی سەنەدەوەش زۆر ڕاست نەبێ، بەڵام ماناکەی ڕاستە: (أوصيكم بالشباب خيراً، فإنهم أرق أفئدة، لقد بعثني الله بالحنيفية السمحاء، فحالفني الشباب وخالفني الشيوخ)[1].

واتە: ئامۆژگارییتان دەکەم کە لەگەڵ گەنجەکان دا، لەگەڵ لاوەکان و تازە پێگەیشتووەکاندا باشبن، (ئامۆژگارییان بکەن و لەگەڵیان نەرم و میهرەبان بن و مشووریان لێ بخۆن و بە خەمیانەوەبن) چونکە ئەوان دڵیان نەرمترە، عەقڵیان تازە ترە، (زیاتر توانای وەرگرتنیان هەیە)، خواش منی ڕەوانەکردوە بە ئایین و بەرنامەیەکی پاکەوە (کە سەراپا ئاشتیی و سەلامەتییە بۆ هەموو لایەك) کەچی گەنجەکان هاوپەیمانم بوون و پشتیان گرتم و، بەساڵداچووەکان دژایەتیی و ناکۆکییان کردم.

---

(١) أخرجه الطبراني والثعالبي.

بەڵێ بەڕێزان! شوێنکەوتووانی پێغەمبەری خوا موحەممەد "صلى الله عليه وسلم" بە تایبەت لە سەرەتاوە هەموویان چینی گەنج و تازەپێگەیشتوو بوون، وەك لەم دەقانەشەوە دیارە:

١- عن جابر بن عبدالله (رضي الله عنهما): (فَلَمَّا نَظَرَ الْعَبَّاسُ فِي وُجُوهِنَا قَالَ: هَؤُلَاءِ قَوْمٌ لَا أَعْرِفُهُمْ، هَؤُلَاءِ أَحْدَاثٌ)[١].

واتە: کاتێك عەبباس تەمەشای دەم و چاومانی کرد گوتی: ئەوانە کۆمەڵێکن نایانناسین، ئەوانە تازە پێگەیشتوون.

٢- (عن رضي الله عنه أنس قال: قدم النبي وليس في أصحابه أشْمَط غير أبي بكر، فَغَلَّفها بالحنّاءِ والكَتَمِ)[٢].

واتە: پێغەمبەر هات (بۆ مەدینە) و هیچ کام لە هاوەڵانی ڕیشیان ماش و برنج نەبووبوو، جگە لە ئەبووبەکر، ئەویش بە خەنە و کەتەم ڕەنگی کردبوو.

٣- (اقتلوا شيوخ المشركين، وآستحيوا الشرخ)[٣].

واتە بەتەمەنەکان هاوبەشدانەران بکوژن و، گەنجەکان بهێڵنەوە.

---

(١) أخرجه الحاكم: ٤٢٥١، وابن حبان: ٧٠١٢، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

(٢) رواه البخاري: ٣٧٠٥.

(٣) أبو داود: ٢٦٧٠، الترمذي: ١٥٨٣ وأحمد.

ئەمەش لە واقیعی سیرەی پێغەمبەردا "علیه الصلاة والسلام" زۆر نمایان و بەرجەستەیە، هەموو ئەوانەی دژایەتیی پێغەمبەری خاتەمیان کرد، ئەوانە بوون کە تەمەنێکیان هەبوو، چونکە مرۆڤ کە دەکەوێتە تەمەنەوە، بەزۆریی وایە، بەڵام هەموو بنچینەیەك هەڵاواردنی، تێدایە ئەگەرنا مرۆڤ کە دەکەوێتە تەمەنەوە، بیرو ڕاو بۆچوونەکانیشی لەگەڵیدا دەکەونە تەمەنەوە، سەرانی قورەیش کە دوژمنی سەرسەختی پێغەمبەر "علیه الصلاة والسلام" بوون، وەك ئەبوو جەهل و ئەبوو سوفیان و ئومەییەی کوڕی خەڵەف، بۆچی دژی پێغەمبەر "علیه الصلاة والسلام" بوون؟! بێگومان تەنیا لەبەر ئەوە نەبوو کە بڕوایان بەوانە نەبێ موحەممەد پێغەمبەری خوایە، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو دەیانگوت: بازاڕمان لێ تێکدەچێ و، ئەگەر ئێمە شوێن موحەممەد بکەوین، بەپێی ئەو بەرنامەو پەیامەی ئەو، ئێمە ئەوەی ئێستا هەمانە، نامانمێنێ! کە بریتی بوو لەوەی:

أ- لەڕووی سیاسییەوە ئەوان باڵادەستبن و، خەڵکی دیکە هەمووی وەك هاووڵاتیی پلە دوو و سێ، یان وەك کۆیلەو خەڵکێکی ژێر دەست بێ.

ب- لە ڕووی ئابوورییەوە هەر ئەوان سەروەتمەندبوون و، خەڵکی دیکە دەبووایە چاوی لەدەستی ئەوانبێ.

ج- لە ڕووی فیکرییەوە هەر ئەوان ئاڕاستەکەربوون.

د- لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە هەر ئەوان باڵا دەست بوون و خەڵکی دیکە وەك دەست و پێوەند تەماشا دەکرا، ئەو زلە زلانە دەیانگوت: ئەو پەیامەی موحەممەد هێناویەتی دەڵێ: هەمووتان لە ئادەمن و ئادەمیش لە گڵە، (أَنْتُمْ بَنُو آدَمَ، وَآدَمُ مِنْ تُرَاب)[١]، ئەو پەیامە دەڵێ: هەمووتان لە دایك و بابێك هاتوون، دابەشکراون بۆ چەند گەل و تیرەیەك، بەڕێزترتان لەلای خوا ئەوەیە کە پارێزکارتربێ:

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ...﴾ الحجرات: ١٣.

کەواتە: ئێمە ئەو ئیمتیازە ناشەرعییانەی هەمانن، لەدەستیان دەدەین! بۆیە ئەوانە دژی پێغەمبەری خاتەم "صلى الله عليه وسلم" بوون، لەبەر بەزم و بازاڕە ناشەرعییەکەی خۆیان کە لێیان تێکدەچوو و، کە دوایی لێشیان تێکچوو، هەروەها ئێستاش هەر وایە، ئێستاش تەماشا بکەن، لە درێژایی و پانایی جیهانی ئیسلامییدا، کێ یەخەو بەربینگ دەگرێ بە ئەهلی ئیسلام؟! بە تەوژمی ئیسلامیی؟! تەوژمی ئیسلامیی هاوسەنگ کە عەقڵ و دڵی خەڵك دەدوێنێ! کە لە سەنگەری مەزڵوومانداو یەخەی زاڵمان دەگرێ! کێیە لە دژی ئەو تەوژمەیە! هەموو ئەوانەی چاویان لەوەیە خەڵك ئاژەڵ و مەڕبێ و، ئەوانیش شوان و گاوانی بن، هەموو ئەوانەی چاویان لەوەیە قۆرخکاریی سیاسیی، ئابووریی،

---

(١) أخرجه أبو داود: ٥١١٨، وحسنه الألباني.

کۆمەڵایەتیی هەر لە دەستی ئەواندابێ و، خەڵکیش خزمەتکارو خەدەم و حەشەم بێ!!

ئێستاش هەر هەمان واقیعە دووبارە دەبێتەوە، گومانی تێدا نیە ئەوەی لە مێژوودا دەیبینین، لە واقیعی ئێستایشدا هەروای دەبینین.

ئنجا ئایا چاوەڕوانیی گەورە لە کێ دەکرێ بۆ گۆڕینی واقیع ؟! بێگومان لە چینی گەنج و تازە پێگەیشتوو دەکرێ!

چ ئەوانەی کە بەرنامەی چاکە و خێریان بەدەستەوەیەو، چ ئەوانەش کە بەرنامەی شەڕو خراپەیان بەدەستەوەیە، هەموویان هەر کار لەسەر چینی گەنج دەکەن، وەنەبێ تەنیا ئەوەی خێرو قازانج و چاکەی خەڵکی دەوێ، کار لەسەر چینی گەنج و تازە پێگەیشتوو بکات، ئەوەی شەڕو خراپەیشی دەوێ هەر کار لەسەر چینی گەنج دەکات، بەڵام ئەوانەی بەڕێی خواو پێغەمبەری خوادا دەڕۆن، دەیانەوێ گەنجەکان ئازادو ئازابن، سەربەست و وریابن، خاوەنی خۆیان بن و، لەسەر ڕاستە شەقامی خوابن، کەرامەت و حورمەتیان پارێزراوبێ، ئەوانی دیکەش دەیانەوێ بیانکەنە سووتەمەنیی بۆ خۆیان و ئامرازو داردەستی خۆیان، بابای لاڕێ و ستەمکار و لار، حەقی نیە داخۆ گەنج و لاوەکان: ئازادن، یان کۆیلە؟ خوێندەوارن، یان نەخوێندەوار؟ ڕەوشتیان هەیە یان بێ ڕەوشتن؟ گرنگ ئەوەیە بەکەڵکی ئەو بێن و وەك مەقاشێك و ئامرازێك بەکاریان دێنن.

دوو: لە قورئان و سوننەتدا

**أ- لە قورئـــاندا:**

ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئان بکەین، لە قورئاندا وشەی (شاب) یان (شباب)[1] بەکارنەهاتوە، بەڵام لەجیاتی وی وشەی (فتى)[2] بەکار هاتوە، نۆ جاران وشەی ناوبراو بەکارهاتوە:

**یەکەم: لە سوورەتی (الکهف)دا چوار جاران هاتوە:**

١-﴿ إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ...﴾ الكهف: ١٠.

٢-﴿ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾﴾ الكهف: ١٣.

٣-﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ﴾ الكهف: ٦٠.

٤- ﴿ فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا ﴿٦٢﴾﴾ الكهف: ٦٢.

---

(١) الشباب: من أدرك سن البلوغ ولم يصل إلى سن الرجولة.
الشباب: اسم جمعٍ، شُبّان جمع شاب، وشواب جمع شابة، وشوائب جمع شبة، المعجم الوسيط ص.٤٧.

(٢) الفتوة والفتى: الشابُّ القوي، والجمع: فتية و فتيان، فترة بين المراهقة والرجولة، المعجم الوسيط، ص٦٧٣.

دووەم: هەروەها لە سوڕەتی (یوسف)دا سێ جاران بەکار هاتوە:

١-﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِ ﴾ يوسف ٣٦

٢- ﴿ وَقَالَ لِفِتْيَٰنِهِ ٱجْعَلُواْ بِضَٰعَتَهُمْ فِي رِحَالِهِمْ.... ﴾ يوسف: ٦٢

٣- ﴿ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفْسِهِۦ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا .... ﴾ يوسف: ٣٠

سێیەم: هەروەها لە سووڕەتی (الأنبياء)دا، یەك جار هاتوە:

﴿ قَالُواْ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٠﴾ ﴾ الأنبياء.

چوارەم: لە سووڕەتی (النور)یش دا، یەك جار هاتوە[1]:

﴿ وَلَا تُكْرِهُواْ فَتَيَٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا .. ﴾ النور: ٣٣.

کە لە کۆمەڵگای ئەوسادا، هەندێك لەوانەی خەڵکی مەدینە بوون، هەندێك لە ئافرەتانیان بەکاردەهێنان بۆ کاری خراپ و بازرگانییان پێدەکردن، هەروەك ئێستا لەم کۆمەڵگایەی ئێمەشدا لەلایەن هەندێك لە دەسەڵاتدارانی گەندەڵ و پۆخەڵی ئەم وڵاتەوە، بەشێوەیەکی دیکەی جیاواز ئەوە هەیە.

هەروەها هەر لەو ڕەوت (سیاق)ە دا، دوو وشەی دیکەش هاتوون:

أ- (غلام) لە سووڕەتی (مریم)دا:

﴿ يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسْمُهُۥ يَحْيَىٰ لَمْ نَجْعَل لَّهُۥ مِن قَبْلُ سَمِيًّا ﴿٧﴾ ﴾ مريم: ٧.

---

(١) کەواتە: ٤+٣+١+١=٩.

واتە: ئەی زەکەریيا ئێمە بە (پێدانی) گەنجێك مژدەت پێدەدەین، ناوی یەحیایە پێشتر هاوناومان بۆ دانەناوە.

ب- (ذرِّيَّة) لە سوورەتی (یونس)دا:

﴿ فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوۡمِهِۦ عَلَىٰ خَوۡفٖ مِّن فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِمۡ أَن يَفۡتِنَهُمۡۚ وَإِنَّ فِرۡعَوۡنَ لَعَالٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٨٣ ﴾ یونس: ٨٣

واتە: جگە لە گەنج و تازە پێگەیشتووانێك لە خەڵكەكەی، هیچكـــەس بڕوای بـــە مووســـا نەهێنا لە ترسی فیرعـــەون و بڕیاربەدەستەكانی كە بیانچەوسێننەوە، بێگومان فیرعەون لە زەویدا خۆبەرزكەرەوە بوو و بە دڵنیایی ئەو لە زێدەڕۆییكاران بوو.

كەواتە: مووساش «علیه السلام» لە سەرەتاوە بەس گەنجانێك لە گەلەكەی بڕوایان پێهێناوە و، گوێیان بە ئازار و ئەشكەنجەی فیرعەون و دەستە و دایەرەكەی نەداوە.

بەڵێ بەڕێزان! گەنج و لاوە خۆشەویستەكان!

أ- خوای پەروەردگار لە قورئاندا زۆر بە گرینگییەوە بۆمان باسی گەنج دەكات، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الكهف)دا خوای تاك و پاك باسی كۆمەڵێك گەنج دەكات، كە بەسەرهاتەكەیان شتێكی زۆر سەرسوڕهێنەرە، حەوت گەنج كە هەشتەمیان سەگێك بووە و لەگەڵیان بووە، یاخود شەش بوون و حەوتەمیان سەگەكەیان

بووه، بەڵام ڕای یەکەم بەهێزترە، لە حوکمڕانی ڕۆژگاری خۆیان (دەقیانووس) عاسیێ دەبن و، ئامادە نابن بۆی ملکەچ بن و ژێردەستبن، لێی هەڵدەگەڕێنەوە، بەپێی ئەوە کە لە کتێبە مێژووییەکانیشدا هاتوە، من لە تەفسیری سوڕەتی (الكهف)دا باسم کردوە، واپێدەچێ ئەوانە خەڵکی خاوەن پێگە بووبن لە نێو کۆمەڵگادا، یانی کوڕانی بەرپرسان بووبن، ئەوانە مل دەدەنە شاخ و، پەنا دەبەنە بەر ئەشکەوتێك و، ئامادە دەبن ژیانی نێو ئەشکەوت بگوزەرێنن، بەڵام ملکەچ نەکەن بۆ ئەو واقیعە زاڵمانەیەی، حوکمڕانی ئەوکاتە بەسەر کۆمەڵگاکەی دا فەرزی کردوە.

دیارە شەش حەوت کەس توانای ئەوەیان نیە کۆمەڵگایەکەیان بگۆڕن و، ڕەنگە بەرنامەیەکی واشیان لەبەردەست دا نەبووبێ، تەنیا ئەهلی تەوحیدو ئیمان بووبن، بۆیە بەس ئەوەندەیان لەدەست هاتوە، کە کۆمەڵگایەکەیان بەجێ بهێڵن و، نەبنە بەشێك لەو واقیعە گەندەڵ و خراپەیان.

ب- هەروەها خوای پەروەردگار بۆمان باسی ئیبراهیم دەکات و بە وشەی (فتى) ناوی دەهێنێ، ئیبراهیم "عليه الصلاة والسلام" کاتێك لەگەڵ گەلەکەی خۆیدا ڕووبەڕوو دەبێتەوەو، بتەکانیان لێ دەشکێنێت، دوایی خەڵکەکەی بەسەر ئەو حاڵەدا دەچنەوە و بەسەرسوڕمانەوە ئەم قسەیە دەکەن:

﴿ قَالُواْ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٩﴾ ﴾ الأنبياء - ٥٩

واتە: گوتیان: کێ ئەوەی بە پەرستراوەکانتان کردوە، بەدڵنیایی ئەو لە ستەمکارانە!

دوایی هەرخۆیان یان کۆمەڵێکی دیکەی جیاواز لە پرسیارکەرەکان، ئاوا وەڵام دەدەنەوە:

﴿ قَالُواْ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ۝٦٠﴾ الأنبياء – ٦٠.

واتە: دەڵێن: گوێبیست بووین گەنجێك باسی دەکردن، (باسی ئەو پەرستراوانەی ئێمەی دەکرد)، پێی دەگوترێ: ئیبراهیم.

وادیارە ئەوکاتە (ئیبڕاهیم) هێندە ناو و ناوبانگی نەبووە، وەك دوایی خوای کاربەجێ کردوویەتی بە پێغەمبەر، وا پێدەچێ ئەو ڕووداوە پێش وەحیی بۆهاتنی بووبێ و بەس گەنجێك بووە، بەڵام چ گەنجێك!!

خوای بەرزو مەزن زۆر بە گرنگیی پێدانەوە باسی ئیبڕاهیم دەکات کە دوایی ئیبڕاهیم "علیه الصلاة والسلام" لەسەر ئەو بت شکاندنەی ئاگرێکی بۆ نێڵ[1] دەدەن، دەیخەنە نێو مەنجەنیقەوە و بە مەنجەنیق فڕێیدەدەنە نێو مەشخەڵانی ئاگرەوە، چونکە ئاگرەکە زۆر بەرز بووە و، هەرکەسێك نزیکی بووایە بۆ خۆیشی دەسووتا، بۆیە بە مەنجەنیق فڕێیانداوە، بەڵام خوای باڵادەست لە فریای دێ، وەك فەرموویەتی:

---

(١) نێڵ دان: داگیرساندن بە جۆرێك زۆر کڵپەدار و بە بڵێسە بێ.

﴿ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ ﴾ الأنبياء – ٦٩.

واته: گوتمان ئەی ئاگر! ساردبەوەو سەلامەتبە لەسەر ئیبراهیم.

**ب- له سـوننــەت دا:**

ئەگەر تەماشای سوننەتی موحەممەد پێغەمبەریش "صلی الله علیه وسلم" بکەین، دەبینین فەرمایشتی زۆرن لەبارەی گەنج و لاوانەوە، لە کوڕان و لە کچان و، دەگونجێ لەوبارەوە زۆر فەرمایشت بێنین، یەکێك لە فەرمایشتەکان ئەوەیە کە دەفەرموێ:

١- (اغْتَنِمْ خَمْسًا قبلَ خَمْس : شَبابَكَ قبلَ هَرَمِكَ ، وصِحَّتَكَ قبلَ سَقَمِكَ، وغِناكَ قبلَ فَقْرِكَ ، وفَرَاغَكَ قبلَ شُغْلِكَ ، وحَياتَكَ قبلَ مَوْتِكَ)[١].

واتە: بەهرە وەربگرە لە پێنج شتان، پێش ئەوەی پێنج دژیان بۆ پەیدابن: یەکەم: بەهرە وەربگرە لە گەنجێتییت بەرلەوەی پیریی ڕووت تێبکات.

دووەم: بەهرە وەربگرە لە تەندروستیی و لەشساغییت، بەرلەوەی دژەکەی پەیدابێ، کە نەخۆشیی و دەردەدارییتە.

---

(١) أخرجه ابن أبي الدنيا في ((قصر الأمل)): (١١١)، والحاكم: (٧٨٤٦)، والبيهقي في ((شعب الإيمان)): (١٠٢٤٨)، وصححه الألباني في ( صحيح الترغيب) (٣٣٥٥).

سێیەم: بەهرە وەربگرە لە دەوڵەمەندییت، بەرلەوەی هەژاریی و نەدارییت بەملدابێ.

چوارەم: بەهرە وەربگرە لە دەست بەتاڵیت پێش ئەوەی سەرقاڵییت بۆ پەیدا ببێت.

پێنجەم: بەهرەمەندبە لە ژیانت، بەرلەوەی دژەکەی پەیدابێـت کە مردنتە.

ئەمە بە دڵنیاییەوە ئامۆژگارییەکی زۆر بەهێزو بەپێزی پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) کە بەرنامەیەکە بۆ ژیان، ئەگەر مرۆڤ ئاگای لە ژیانی بێ و، ئاگای لە تەندروستیی بێ و، ئاگای لە گەنجێتیی و لاوێتیی بێ و، ئاگای لە حاڵەتی دەستبەتاڵیی و بێ ئیشیی بێ و بەفیرۆی نەدات وەك ئەوانەی بە درێژایی ڕۆژ و شەوان لە چایخانەو کافتریاکاندا دەکەون، خەریکی چی دەبن؟! یان خەریکی نێرگەلە کێشان، یان جگەرە کێشان، یان قوماركردن، ئەو شتانە کە بەس تەمەنی مرۆڤ دەسووتێنن و بەس زیانیان هەیە.

هەروەها ئەگەر مرۆڤ ئاگای لە کاتی ماڵ و سامان و دەسترۆیشتنی و، توانای ماددیی بێ، کە لە خێردا بەکاری بێنێ، نەك لە تێکدان و خراپەدا، بەرلەوەی هەژاریی و نەداریی ملی بگرێ، بێگومان لە دنیاو دوارۆژدا بەختەوەر دەبێ.

٢- فەرمایشتێکی دیکەی پێغەمبەر "علیه الصلاة والسلام" هەیە: (عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ :

(لَا تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ، وَعَنْ عِلْمِهِ فِيمَ فَعَلَ، وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَ أَنْفَقَهُ، وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَ أَبْلَاهُ)[(١)].

واتە: دوو پێی ئادەمزاد لە خزمەت پەروەردگاریدا، لە ڕۆژی دواییدا بەملاولادا ناچن، هەتا پرسیاری لێ نەکرێ لەبارەی پێنج شتەوە:

١- پرسیاری لێدەکرێ لەبارەی تەمەنەکەیەوە لە چیدا بەڕێی کردوە؟

٢- پاشان لە گەنجێتیی لە چیدا تەواوی کردوە؟

٣و٤- هەروەها لە ماڵ وسامانەکەی چۆنی پەیداکردوەو، لە چیدا خەرجی کردوە؟

٥- ئەو زانیارییەش کە خوا پێیداوە، چەندە کاری پێکردوە؟

ئنجا بەڕێـــزان!

ئایا کۆمەڵگایەکەی پێغەمبەری خوا "صلی الله علیه وسلم" ئەوانەی پێغەمبەری خاتەم ئەو گۆڕانکارییەی پێکردن، کە ئێستا ئێمەو غەیری ئێمە لە مسوڵمانان، لە گۆشەو کەنارەکانی دنیادا، بەڵکو لە غەیری مسوڵمانانیش بەهرەمەندن لەو گۆڕانکارییە مەزن و ڕیشەیی و کاریگەرە، بەکێی کرد؟ بە دڵنیایی بە پلەی یەکەم

---

(١) أخرجه الترمذي: ٢٤١٧، هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

بەچینی تازە پێگەیشتوو و چینی گەنجی کرد، هەڵبەتە دوایی خەڵکی بەتەمەنیش هاتنە نێوەوە، دوای ئەوەی تەماشایان کرد ئیسلام گەشەی کرد، ئەوانیش هاتن، ئنجا هەبوو بەقەناعەتەوە هات و، بۆی دەرکەوت کە لەسەر بەتاڵ و پووچ بووە، هەشبوو بۆ بەرژەوەندیی هات و، هەشبوو بە ناچاریی هات، کە هەندێکیان بوونە مونافیق، واتە: بەڕواڵەت مسوڵمان و لەدڵی خۆیاندا کافر بوون.

٣- دەقی سێیەم کە لەوبارەوە دەیهێنین:

(يَا مَعْشَرَ الشَّبَاب، مَن اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ ؛ فَإِنَّهُ لَهُ وجاء)[1].

واتە: ئەی کۆمەڵی گەنجان! هەرکامێکتان توانای هاوسەرگیریی هەبوو، با هاوسەرگیریی بکات، هەم بۆ ڕوانینی چاوی (لە حەڕامیی) لێگرەوەترەو، هەم بۆ داوێن پارێزەرترە، هەر کەسیش نەیتوانی (هاوسەرگیریی بکات) با ڕۆژوو بگرێ، بۆی دەبێتە هاوکاری کەمکردنەوەی ئارەزووی جینسیی.

گەنج و لاوە خوێن گەرم و گورج و گۆڵەکان!

کۆتایی ئەم تەوەری یەکەم کە تەرخانمان کردوە بۆ خستنە ڕووی گرنگیی و کاریگەریی قۆناغی گەنجێتیی و، کاریگەریی توێژی گەنج و لاوان لە گۆڕانکاریی کردن لە کۆمەڵگادا، بە دەقێکی

---

(١) البخاري: ٥٠٦٥.

سوننەت دێنین کە پێشتریش هێنابوومان، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە ئەوانەی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد "صلی الله علیه وسلم" گۆڕانکاریی پێکردن، زۆربەی هەرەزۆریان توێژی گەنج و تازە پێگەیشتووان بوون:

(عن أنس خادم النبي صلى الله عليه وسلم قال: قدم النبي صلى الله عليه وسلم، وليس في أصحابه أشمط غير أبي بكر، فغلّفها بالحِنّاء والكَتم)[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێ: پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" هات بۆ مەدینە، کە لەنێو هاوەڵانیدا کەسیان تێدا نەبوو سەرو ڕیشی ماش و برنج بووبێ، [(أشمط) یانی ڕەش و سپی تێکەڵ] جگە لە ئەبووبەکر، ئەویش (خوا لێی ڕازی بێ) بە خەنەو بە کەتەم (ئەویش ماددەیەکە وەك خەنە) ڕەنگی کردبوو (کە مووە سپیەکانی دیار نەبن، ئەگەرنا ئەوانی دیکە هەموو مووەکانیان ڕەش بوون، واتە: هەموویان چینی گەنج بوون).

کەواتە: با خۆمان پێ کەم نەبێ کە گەنجین و تازە پێگەیشتووین و تازە دێینە نێو ژیانەوە، چونکە گۆڕانکاریی ئەگەر چینی گەنج و تازە پێگەیشتوو نەیکات، بەخەڵکی دیکە ناکرێ و، گومانیشی تێدا نییە کە توێژەکانی کۆمەڵگا سەرجەمیان، بەتایبەت گەنج و لاوان و، تەمەندارو کامڵان پێویستە خۆیان لە دەمارگیریی بۆ توێژی

---

(١) صحيح البخاري: (٣٧٠٥).

خۆیان و هەستیاریی دەرهەق بە توێژی بەرانبەر، دووربگرن و دڵنیابن کە ژیان و کۆمەڵگا لە هیچ کامیان بێنیازنییەو هەرکامیشیان حەوجێی ئەوی دیکەیەو پێویستە هەموویان تەواوکەری یەکدی بن، کۆمەڵگای تەندروستییش ئەو کۆمەڵگایەیە کە چین و توێژو پێکهاتەکانی، پەیوەندیی تەواوکاریی (تكاملي) یان پێکەوە هەبێ، نەك پەیوەندیی دژایەتیی و ناکۆکیی (تناحري).



## گەنج و لاوە خۆشەویستەکان!

لەم تەوەری دووەمدا، هەوڵدەدەین لە حەوت بڕگەدا، هەستی ڕاست و دروست و، هەڵوێستی پێویست و پڕ بە پێستی گەنج و لاوێکی سەر ڕاست (رشید) چ کوڕ چ کچ، بخەینە ڕوو، چونکە بێگومان هەست و هەڵوێست (الشعور والموقف) ئەگەر ڕاست و دروست نەبن، خاوەنەکەیان نەك هەر لێیان بەهرەمەند نابێ، بگرە زۆریشیان لەسەر قەرزدار دەبێتەوە.

حەوت بڕگەکانـی ئەم تەوەرەیەش ئەمانەن:

١ـ هەست و هەڵوێستی گەنج بەرانبەر بە خۆی و گەردوون.

٢ـهەست و هەڵوێستی گەنج، بەرانبەر بەخوای بەدیهێنەر و پەروەردگار.

٣ـ هەست و هەڵوێستی گەنج، بەرانبەر بە پێغەمبەران "علیهم الصلاة والسلام" و پەیامەکانیان.

٤ـ هەست و هەڵوێستی گەنج، بەرانبەر بە خەڵك و مرۆڤایەتیی.

٥ـ هەست و هەڵوێستی گەنج، بەرانبەر بە نەتەوەو نیشتمانەکەی.

٦ـ هەست و هەڵوێستی گەنج بەرانبەر بە ئۆممەتەکەی.

٧ـ هەست و هەڵوێستی گەنج بەرانبەر بە کۆمەڵگایەکەی.

١ـ هەست و هەڵوێستی گەنج بەرانبەر بە خۆی و گەردوون:

بەرێـــــزان!

پێم وایە یەکەمین و گرنگترین هەستی ڕاست و هەڵوێستی پێویست، کە پێویستە گەنج و لاوێك "کوڕو کچ" لە واقیعی ئێستادا لە خۆیدا بیهێنێتەدی، بریتیە لە هەست و هەڵوێستی بەرانبەر بەخۆی و گەردوون.

چونکە هەموو مرۆڤێکی ژیر، دوای ئەوەی خونچەی عەقڵی دەپشکوێ و خۆی دەناسێ و، سەرنجی بوونەوەرو دەوروبەری دەدات، خولیا و ئاواتی هەرە گەورە و بنەڕەتیی ئەوە دەبێ بەسەرهاتی خۆی و گەردوون تێبگات:

من چیم و کێم؟

لە کوێوە هاتووم و بۆچی و، بەرە و کوێ دەچم؟

ئەم گەردوونە (ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیان) چییەو، بۆچی دروستبوون و، لەکوێوە هاتوون و، بەرەو کوێ دەچن و، پێویستە چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەین؟!

ئەو پرسیارە بوونییانە (الأسئلة الوجودیة)ی فەلسەفە هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانیەوە هەتا ئێستا، بەدوای وەڵامەکانیانەوە بووە،

بەڵام "بەڕای بەندە" بە دەستی خاڵیی و بەبێ مرادیی گەڕاوەتەوە و، هیچی دەستگیر نەبووە!

بەڵام خوای زاناو شارەزا "سبحانە وتعالی" وەڵامی سەرجەم ئەو پرسیارانەو زۆری دیکەشی، خستوونە نێو دوو توێی ژمارەیەك لە ئایەتەکانی قورئانەوە، کە ئەمانە چەند نموونەیەکیانن:

١ـ ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَـٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ الطور.

واتە: یان ئایا بەبێ هیچ شتێك "بەبێ بەدیهێنەر" دروستبوون، یان ئایا خۆیانن بەدیهێنەر (بۆ خۆیان)؟ یان ئایا ئاسمانەکان و زەوییان هێناونە دی؟ بەڵکو دڵنیانین (زانیارییەکی دڵنیاکەریان نیە).

٢ـ ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآئِ رَبِّهِمْ لَكَـٰفِرُونَ ﴿٨﴾ ﴾ الروم.

واتە: ئایا لە (دڵی) خۆیاندا بیریان نەکردۆتەوە: خوا ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانی بە حەق نەبێ و، بۆ کاتێکی دیارییکراو نەبێ، دروست نەکردوون؟ بە دڵنیاییش زۆرێك لە خەڵکی بە دیداری پەروەردگاریان بێبڕوان.

٣ـ ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَـٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت.

واتە: لەمەو دوا نیشانەکانی خۆمانیان لە ئاسۆیەکان و لە نەفسی خۆشیان دا پێشان دەدەین، تاکو بۆیان دەربکەوێ کە (خوا، قورئان) هەقە، ئایا بەس نیە کە پەروەردگارت بەسەر هەموو شتێکەوە چاودێرە؟

٤- ﴿ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ وَلِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ الجاثية.

واتە: هەروەها خوا ئاسمانەکان و زەوی بە حەق دروست کردوون و، تاکو هەرکەس بە پێی ئەوەی کردوویەتی، سزاو پاداشت بدرێتەوەو، ئەوان ستەمیشیان لێ ناکرێ.

٥- ﴿ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمۡ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ فاطر.

واتە: (خوا) ئەو کەسەیە ئێوەی کردۆتە جێنشین لە زەویدا...

٦- ﴿ إِنَّا عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ مِنۡهَا وَحَمَلَهَا ٱلۡإِنسَٰنُۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومٗا جَهُولٗا ﴿٧٢﴾ ﴾ الأحزاب:

واتە: ئێمە سپاردەمان لەسەر ئاسمانەکان و زەوی و چیایەکان ڕانواند، بەڵام ئامادەنەبوون هەڵیبگرن و لێی ترسان و، مرۆڤ هەڵیگرت بە دڵنیایی ئەویش زۆر ستەمکاری نەفامە.

لەو ئایەتە بە پێزانەش کە چەند نموونەیەکی کەمن لەوبوارەدا، ژمارەیەك ڕاستیی و گەورەو گرنگ لە بواری بوونناسیی (معرفة الوجود)دا دەستگیر دەبن وەك:

یەکەم: مرۆڤ، خوای بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێنەرو خاوەن و پەروەردگاریەتی و، ئەگەر زانیارییەکی تەواوی دڵنیاکەری هەبێ، دەزانێ کە لە ڕووی عەقڵ و لۆژیکەوە، ناگونجێ دروستکرانی مرۆڤ و گەردوون پاڵبدرێتە لای جگە لە خوای بەدیهێنەر. (الطور - ٣٥-٣٦).

دووەم: خوا ـ عزوجل ـ گەردوون (کون)ی بە هەق و بۆ کاتێکی دیارییکراو هێناوەتە دی، بەڵام زۆرێك لە خەڵك بەدیداری پەروەردگاریان بێبڕوان (الروم -٨-).

سێیەم: هەتا زانست پتر بەرەو پێش بچێ و، نهێنییەکانی خوا لە خودی مرۆڤەو ئاسۆیەکانیشدا زیاتر دەردەکەون و، پەردەیان لەسەر لادەچێ و، بەرەو پێشچوونی زانست هۆکاری زیاتر دەرکەوتنی ڕاستێتیی خواو قورئانە. (فصلت -٣٥-)

چوارەم: ئەو حەق و حیکمەتەی خوای کار بەجێ کردوویەتە ئامانجی ژیانی مرۆڤ و کۆی گەردوونیش ـ بە پێی زانیاریی ئێمە ـ بریتیە لە تاقیکردنەوەی مرۆڤ و سزاو پاداشتدرانەوەی. (الجاثیة -٢٢-)

پێنجەم: مرۆڤ جێنشینی خوایە لەسەر زەوی و، هەڵگری سپاردەکەیەتی، کە بە ئاسمانەکان و زەوی و چیایەکان هەڵنەگیراوە. (فاطر -٩٣-) و (الأحزاب -٢٧-)

بەدڵنیاییش هەبوونی بوونناسییەکی ڕاست و دروست، کە بریتیە لەو بوونناسییەی لە وەحیی پارێزراو و دەستکاریی نەکراوی خوادا بەرجەستەیە، بناغەی هەست و هەڵوێستی گەنج و لاو و، جگە لەوانیشە لەبەرانبەر: گەردوون و، خوای بێ وێنە و، پێغەمبەران و، مرۆڤایەتیی و، نەتەوە و نیشتمان و، ئوممەت و، کۆمەڵگاو...هتددا.



٢ـ هەست و هەڵوێستی گەنج بەرانبەر بە خوای بەدیهێنەرو

پەروەردگار:

بە دڵنیاییەوە هەست و هەڵوێستی ڕاست و دروستی مرۆڤ، بەرانبەر بە خوای بەدیهێنەرو خاوەنی، هەڵقوڵاوی کانیاوی بووناسییەتی و، هەمیشە بووناسیی ڕاست و ساغ، بەرهەمهێنەری هەست و هەڵوێستی ڕاست و دروستە بەرانبەر بە خوا، کە لە:

ناسین و، بڕواپێهێنانی و، پەرستنی و، بەندایەتیی بۆ کردنی و، پارێزلێکردنیدا، نمایان دەبێ، با لەو بارەوە سەرنجی چەند ئایەتێك بدەین:

١ـ﴿ ۞ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ إبراهيم: ١٠.

واتە: پێغەمبەرانیان گوتیان: ئایا لە (بوونی) خوای پەیداکەری ئاسمانەکان و زەوییدا، دوودڵیی هەیە؟!

٢ـ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ هَلْ مِنْ خَٰلِقٍ غَيْرُ ٱللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣﴾﴾ فاطر.

واتە: ئەی خەڵکینە! یادی چاکەی خوا بەسەر خۆتانەوە بکەنەوە، ئایا جگە لە خوا، بەدیهێنەرێکی دیکە لە ئاسمان و زەوییەوە بژیویتان دەدات؟ جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، بەرەو کوێ لادەدرێن؟

٣ـ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ البقرة.

واتە: ئەی خەڵکینە! ئەو پەروەردگارەتان بپەرستن کە ئێوەش و ئەوانەی پێش ئێوەشی هێناونەدی، بەڵکو پارێز بکەن.

کەواتە:

یەکەم: خوا ناسیی شتێکی ڕوون و خوا ڕسك، لە ناخی مرۆڤدا، بە بەڵگەی ئەوە کە پێغەمبەران ـ علیهم الصلاة والسلام ـ بەسەر سوڕمان و نکووڵییلێکردنەوە دەپرسن: ئایا لە بوونی خوای پەیداکەرو داهێنەردا دوو دڵیی هەیە؟! (إبراهیم -١٠-).

دووەم: بژیودانی خوا بۆ مرۆڤ لە ئاسمانەکان و زەویدا و، خاوەن چاکە بوونی ڕەهای لە ژیانی دا، پێویستە ـ وێڕای خواڕسك بوونی خوا ناسیی ـ هاندەر و پاڵنەری مرۆڤ بێ، بەرەو خوا ناسیی و خوا پەرستیی و، پەرستنی هەرکەس و شتێکی دیکە جگە لە خوا، لە هەربەش و بوارێکی پەرستن (عبادة)دا، بە لادان و بە لاڕێدا بران دادەنرێ (فاطر -٣-).

سێیەم: بە تەنیا پەرستران و بەندایەتییکران بۆ خوا، بەرهەم و دەرەنجامی سرووشتیی و ڕاستەو خۆی بەدیهێنەرو پەروەردگار بوونیەتی بۆ خەڵك و، خواپەرستیی ڕەسەن و ساغیش، بەرهەمهێنەری پارێزکاریی (تقوی)یە لە خاوەنەکەیدا (البقرة -١٢-).

٣ـ هەست و هەڵوێستی گەنج، بەرانبەر بە پێغەمبەران

«عليهم الصلاة والسلام»

بوارێکی دیکە کە پێویستە کوڕ و کچە تازە پێگەیشتووەکانمان، هەستێکی ڕاست و تەواو و هەڵوێستێکی تۆکمە و نە لەخەشاویان لە بەرانبەریدا هەبێ، بریتیە لە ناسینی پێغەمبەرانی هەڵبژاردەی خواو، پێ ئاشنا بوونیان و، دواتریش بە بەرچاو ڕوونییەوە، شوێنکەوتنیان و وەرگرتنی پەیام و بەرنامەی پێدا نێرراویان و، پیادە و جێ بەجێکردنی لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییماندا.

چونکە بە دڵنیاییەوە مێژوو و واقیعیش سەلماندوویەتی، کە مرۆڤ بەتوانا خودییەکانی (بقدراته الذاتية) لە عەقڵ و پێنج هەستەکان و زگکماك و خەیاڵ... ئەگەر بشتوانێ تا ڕاددەیەك لە بواری ماددیی و جەستەییدا سەرەدەرێك بکات و، بۆ ڕێکخستنی ژیان و گوزەرانی ڕێ بەدەییەکان بکات، مەحاڵە بەبێ وەحیی و هیدایەتی خوا، خۆی و خوا بناسێ و،سەری لە حیکمەت و ئامانجی گەردوون و ژیان دەربچێ و، سەرەنجام بە شێوەیەك ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی خۆی، بگوزەرێنێت، کە مایەی بەختەوەریی دنیای و، سەرفرازیی و شادمانیی ڕۆژی دوایی بێ و، لە بەرانبەر خوای بەدیهێنەرو خاوەنیدا سەربەرزبێ.

هەر بۆیەش خوای میهرەبان هەر لە سەرەتای نیشتەجێ بوونی مرۆڤەوە لەسەر زەوی، پەیتا پەیتا پێغەمبەرانی بۆ ناردوون و، بەرنامەو ڕێنمایی پێویستیشی بۆ بەڕێوەچوونی و گوزەراندنی ژیانێکی شایستەی مرۆڤی جێنشینی خواو، هەڵگری سپاردەکەی، پێدا ناردوون.

بە سەرنجدان لەم ئایەتە بە پێزانەش، ئەوەی گوتمان زۆر جوان ڕوون و درەوشاوەیە:

١ـ ﴿قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ...﴾ النمل: ٥٩.

واتە: بڵێ ستایش بۆ خــــواو، ســـــەلام لەســــەر بەندەکانی کە هەڵیبژاردوون...

٢ـ ﴿ ۞ إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيْمَٰنَ ۚ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾﴾ النساء.

واتە: ئێمە سروشمان بۆ لای تۆ کردوە، وەك چۆن سروشمان بۆلای نووح و پێغەمبەرانی دوای ویش کردوە، هەروەها سروشمان بۆ لای ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و ئەسباط و عیسا و ئەیووب و یونس و هاڕوون و سولەیمان کردو زەبووریشماندا بە

داوود، پێغەمبەرانێکی دیکەش کە بەسەرهاتەکانمان بەسەرتدا خوێندۆتەوەو پێغەمبەرانێکیش کە بەسەرهاتیانمان بەسەرتدا نەخوێندۆتەوەو، خواش بە دواندن قسەی لەگەڵ مووسادا کردوە، (ئەو پێغەمبەرانە) پێغەمبەرانێکی موژدەدەرو ترسێنەرن (بۆیە خوا ناردوونی) تاکو خەڵك دوای (هاتنی پێغەمبەران) بەڵگەی لەسەر خوا نەبێ، خواش هەردەم زاڵی کارزان بووە.

٣ـ ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ ٩٠ ﴾ الأنعام.

واتە: ئەوانە (ئەو هەژدە پێغەمبەرەی لە ئایەتەکانی: ٨٣ ـ ٨٦ دا ناویان هات) کەسانێکن خوا ڕاستەڕێی کردوون، تۆش ڕێی ڕاستی وان چاو لێبکە، بڵێ: هیچ کرێیەکتان لەسەری لێ داوا ناکەم، دەیگەیەنم تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ جیهانییان.

٤ـ ﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣١ قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٢ ﴾ آل عمران.

واتە: (ئەی موحەممەد!) بڵێ: ئەگەر (ڕاست دەکەن) خواتان خۆشدەوێ شوێنم بکەون، خواش خۆشی دەوێن و، لە گوناحتان دەتانبووڕێ و، خواش لێبوردەی بە بەزەییە. بڵێ فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکەن، ئنجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، بە دڵنیایی خوا بێبڕوایانی خۆشناوێن.

ئەو ئایەتە بە پێزانەش ئەم ڕاستییە گەورەو گرنگانەمان دەدەنە دەست:

یەکەم: پێغەمبەران "علیهم الصلاة والسلام" لە لایەن خوای زانای کار بەجێوە، لە نێو کۆی مرۆڤایەتییدا هەڵبژێرراون و، بە گشتیی لە تێکڕای خەڵك چاکترن، لە هەموو ڕوویەکەوە (النمل -٥٩-).

دووەم: بەشێك لە پێغەمبەران، خوای زاناو شارەزا بەسەرهاتیانی بۆ پێغەمبەری خاتەم لە قورئانێ دا گێڕاوەتەوەو، هی بەشێکیشیانی نەگێڕاوەتەوە، (النساء -١٦٤-).

سێیەم: پێغەمبەران مـوژدەدەرو دڵخۆشکەرن و ترسێنەرو ورياکەرەوەن بۆ تێکڕای مرۆڤایەتیی و، هۆکاری بیانوو بڕان و بەڵگە بەدەستەوە نەهێڵرانیانن، لەبەرانبەر خوادا، (کە نەتوانن بڵێن: خوایە! نەماندەزانی پێت خۆشە: چۆن چۆنی ژیان و گوزەرانمان بەڕێ بکەین؟) (النساء -١٦٥-).

چوارەم: شوێنپێ هەڵگرتنی پێغەمبەران و چاولێکردنیان و، پەیڕەویی کردن لەو پەیام و بەرنامەیەی خوای کارزان و میهرەبان پێیدا ناردوون، لەسەر هەموو مرۆڤێك پێویستەو، خوای بەرزو مەزن بۆ چاولێکردنیان و بەسەرمەشق گرتنیان ناردوونی، بۆ ئەوەی مرۆڤایەتیی ئایین و بەرنامەی خوای پەروەردگاری، وێڕای حاڵەتی تیۆریی و فیکریی، بە حاڵەتی جێبەجێکراوییش، لەبەردەستیدا هەبێ، (الأنعام -٩٠-).

پێنجەم: شوێنپێ هەڵگرتنی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ـ صلی الله علیه وسلم ـ بەڵگەی ڕاستیی خۆشویستنی مرۆڤە بۆ خواو، هۆکاری خۆشویستنی خواشە بۆی و، بە پێچەوانەشەوە: پشتێکردنی پێغەمبەر و لێ یاخیبوونی یەکجاریی و ڕەها، هۆکاری کافربوونیەتی، (آل عمران -٣١،٣٢-).

بەڵێ بەڕێزان! پێغەمبەرانی خوا، کەسانێك بوون کە لە هەموو ڕوویێکەوە هەڵبژاردەی نێو مرۆڤایەتیی بوون و، خواش ناردوونی پەیامی خوایان تێبگەیەنن، لە نێو کۆمەڵگای ئێمەدا زۆر کەس کە تەماشای پێغەمبەران "علیهم الصلاة والسلام" دەکات هەر وایان لێ حاڵییە: کە هەندێ خەڵك بوون، هاتوون هەندێك ئامۆژگاریی خەڵکیان کردوەو ڕۆیشتوون! بەڵام نەخێر، پێغەمبەران هاتوون گۆڕانگاریی بکەن، هاتوون سەر زەوی پاکبکەنەوە لە شیرك و کوفرو زوڵم و فەسادو خراپەو، بیڕازێننەوە بە ئیمان و تەوحیدو دادگەریی و چاکە. پێغەمبەران "علیهم الصلاة والسلام" کەسانێك نەبوون بەس دوو ئامۆژگاریی بکەن، یا سێ چوار وتاران بدەن و، وەك هەندێك لە بانگەوازکاران، نا، پێغەمبەران "علیهم الصلاة والسلام" هاتوون گۆڕانگاریی ڕیشەیی و گشتگیر و هەمەلایەنە لە ژیانی مرۆڤایەتییدا بکەن، خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (النساء)دا ئاوا باسی پێغەمبەران دەکات:

﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ ﴾ النساء: ١٦٥.

خوا ناوی دوازده لە پێغمبەران "علیهم الصلاة والسلام" دێنێ و ئاوا دەست پێدەکات:

﴿ إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَـٰرُونَ وَسُلَيْمَـٰنَ ۚ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾ ﴾ النساء: ١٦٣.

دوایی دەفەرموێ: پێغەمبەرانێکی دڵخۆشکەرو ترسێنەرن، موژدەدەرو، ئاگادار کەرەوەن، تاکو خەڵك لە دوای پێغەمبەران بەڵگەی نەبێ لەسەر خوا، بەڵێ پێغەمبەران هاتوون تاکو خەڵك بەڵگەی نەبێـت و، بیانووی نەبێت بڵێ: خوایە! نەمزانی تۆ پێت خۆش بوو چۆن بژیم! پێت خۆش بوو چی بکەم و، چۆن بکەم؟! پێغەمبەران «صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ» هاتوون ڕێی ژیانێکی ڕێك و ڕاست، کە شایستەی مرۆڤە، فێری بکەن، ئەی مرۆڤ! دەبێ لە ڕووی بوونناسییەوە ئاوابی، لە ڕووی ئیمان و عەقیدەتەوە بەو شێوەیە بی، لە ڕووی پەرستشەکانتەوە، لە ڕووی ڕەوشت و ئاکارتەوە، لە ڕووی ئەدەبە کۆمەڵایەتییەکانەوە، لە ڕووی خێزانییەوە، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، لەڕووی سیاسییەوە، دەبێ بەو شێوەیەبی، بۆیەش بەرنامەی تێکڕای پێغەمبەران "علیهم الصلاة والسلام" بەبێ هەڵاواردن، هی هەموویان ئەوەی تێدا هەبووە کە خەڵك چۆن بژی، چۆن بەڕێوەبچێ، لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی دا، بەڵام دوایی لە ڕۆژئاوا و ئەورووپا،

دینی مەسیح "علیه الصلاة والسلام" تەحریف کراو گۆڕدراو، لە نێوەڕۆکەکەی خاڵیی کرایەوە، ئەگەر نا عیسای مەسیحیش "صەڵات و سەلامی خوای لەسەربێ" وەك سەرجەم پێغەمبەران، هاتبوو گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی لە ژیانی کۆمەڵگاکەی خۆیدا بکات، بەڵام دوای خۆی کتێبەکەیان گۆڕی و، دینەکەییان گۆڕی و بەو شێوەیان لێکرد کە ئێستا دەیبینین، کە ئێستا نەسرانییەکان سێ پەرستراوان دەپەرستن: باب و کو و گیانی پیرۆز!

بەڵێ دەبێ بزانین پێغەمبەران "علیهم الصلاة والسلام" کە ئێمە شوێنکەوتووی بەرنامەی خواو ڕێبازی ئەوانین، بۆیە نەهاتوون هەندێ قسەی خێر بۆ خەڵك بکەن و بڕۆن! بەڵکو هاتوون گۆڕانگاریی بکەن، ئنجا ئایا چەند کەسیان توانییان گۆڕانکاریی بکەن، بەو واتایەی بتوانن گۆڕانکاریی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و، سیاسیی بکەن؟ کەمێکیان توانیویانە، بەڵام بێگومان بەرنامەی پێغەمبەران و ئەو بنەماو مەبدەئانەی پێغەمبەران "علیهم الصلاة والسلام" هێناویانن، بەنێو مرۆڤایەتییدا بڵاوبوونەوە و کەسانێك ئەگەر بە تەواوییش نەچووبنە سەر ڕێبازی پێغەمبەران، بەڵام بەهرەمەند بوون لەو هیدایەت و بەرنامەیەی ئەو پێغەمبەرانە هێناویانە، بۆیە دەبێ هەستمان بەرانبەر بە پێغەمبەران ئاوابێ، کە خوا ناردوونی گۆڕانکارییان پێ بکا، نەك تەنیا گۆڕانکاریی سیاسیی، بەڵکو پێش ئەوە گۆڕانکاریی فیکریی، عەقیدەیی، ئەخلاقیی، ئنجا دوایی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی،

چونكە هەمیشە گۆڕانكاری لە واقیعی سیاسیی و كۆمەڵایەتیی كۆمەڵگادا، ڕەنگدانەوەی گۆڕانە لە ناخی مرۆڤەكاندا:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ﴾ الرعد: ١١.

واتە: خوا واقیعی هیچ كۆمەڵگایەك ناگۆڕێ، تاكو ئەوان خۆیان دەگۆڕن.

خۆیان (أنفسهم) یانی: فیكر، هەست و نەست، ڕەوشت و ئاكار، دەبێ لێرەوە گۆڕانكاریی ببێ، كاتێك دەبینین خەڵكێكی زۆری هەرێمی كوردستان بە دوای ئەو دەسەڵاتدارە ستەمكارو گەندەڵانەوەیە، دەبێ لێرەوە بۆ هۆكارەكەی بگەڕێین، كە خەڵك و جەماوەرێكی زۆر، خاوەنی ناخێكی خراپ و ڕزیون: هەم بیرو هزریان، هەم هەست و نەست و دڵ و دەروونیان و، هەم ڕەوشت ئاكاریان، با هەر نەڵێین: حوكمڕانان تەزویر دەكەن، بەڵێ تەزویر دەكەن، فرت و فێڵ دەكەن، بەڵام خەڵكێكی زۆریش تەسلیمیان بووە، با ئێمە لە بەر ڕق هەڵسانمان لە ستەم و زۆرو گەندەڵیی و خۆسەپاندنی دەسەڵاتداران، خاتری خەڵكێكیش نەگرین، كە ئەو دەسەڵاتە گەندەڵ و خۆسەپێنە بە هۆی ئەو خەڵكەوەیە، بازاڕی خۆیان گەرم كردوە، بە هۆی ئەوانەوەیە، دەتوانن ئەو زوڵم و ستەمە بكەن، وەك گوتراوە: بێدەنگیی ستەم دروست دەكات، ستەم بێ دەنگیی دروست ناكات، خەڵك كە بێدەنگ دەبێ، حوكمڕانان بوغڕا دەبن و خۆیان لێ دەگۆڕێ، كاتی خۆی فیرعەون بۆچی وا خۆی لێ گۆڕاو بە خەڵكەكەی میسری گوت:

﴿أَنَا رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾﴾ النازعات.

واتە: من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم؟!

چونکە تەماشای کرد هەرچی دەیڵێ، کەس ناڵێ نەخێرو، کەس لە دەمی ناداتەوە، کەس ناڵێ وا نیە، هەمووی وەك مەڕ تەسلیمە، ئنجا مادام زۆربەی خەڵکەکە مەڕو بزن بن، ئەویش شوانەو چۆنی بوێ: وایان لێ دەخوڕێ، ئەگەر میللەت ببێتە ئاژەڵ و مەڕ، حوکمڕانیش خۆی دەکات بە شوان و گاوان و خۆییان بەسەردا دەسەپێنێت، خوای پەروەردگار لەبارەی فیرعەونەوە دەفەرموێ:

﴿ فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ ﴾ الزخرف: ٥٤.

واتە: (فیرعەون) خەڵکەکەی خۆی، کۆمەڵگایەکەی خۆی، سووککرد، (فاستخفَّ)، یان بە مانای: (جعلهم أخفّاء) سووکی کردن، یا بە مانای پووچ (سخیف)ی دیتن[١]، واتە: لە نێوەڕۆکی خۆیان خاڵیی کردنەوە، (فأطاعوه)، ئەمجار بەقسەیان کرد، هەر بۆیەش، هەموو ئەوانەی چاویان لەوەیە حوکمڕانییەکی ستەمکارانە بکەن و، دەیانەوێ موقەددەراتی عیبادو بیلاد لە دەستی خۆیان و حیزب و خزمیاندابێت، هەموو ئەوانە بەرژەوەندییان وا دەخوازێت، خەڵك بە بێ ئاگایی و بە نەفامیی و نەزانیی بمێنێتەوە، هەمیشە لاساکەرەوەبێت و خاوەنی ئازایەتیی و ئازادیی نەبێ، خاوەنی

---

(١) ثوب سخيف النسج: پۆشاکێك کە خراپ چنراوە، یانی بێهێز و پێزە، (سَخَّفَهُ: جَعَلَهُ خَفيفاً، و نَسَبَهُ إلى السَّخْف وهو الضّعْفُ)، المعجم الوسيط، ص ٤٢١.

داهێنان نەبێ، خاوەنی عەقڵ و ئیرادەی خۆی نەبێ،چونکە ئایا مرۆڤێ خاوەنی عەقڵ و ئیرادەی خۆی بێ، مرۆڤێك ڕێزو حورمەتی خۆی بناسێت، خۆی هەرزان فرۆش دەكات بە تۆزە مەعاشێكی حەڕام؟! بێگومان ئەو مەعاشە وەختێ حەڕام دەبێ كە لەبەرانبەریدا كاری حەڕام بكرێت، ئەگەر نا هەموو ئەوانەی مووچەیەك وەردەگرن، لەبەرامبەر كارێكی حەڵاڵدا، مووچەكەیان حەڵاڵە، بەڵام كەسێك، كە تەزویری پێ دەكرێ و، ستەم و خراپەی پێدەكرێ و، ئیرادەكەی زەوت دەكرێ! ئەو مووچە و خەڵاتەی لە بەرانبەردا ئەوەدا وەری دەگرن، پیس و حەڕامە، ئەوانەی سەرۆك حیزب و، حوكمڕانەكەیان دەڵێ: چیم پێگوتن، دەبێ وابڵێن و، وا بكەن، بێ ئەوەی خۆشتان قەناعەتتان وابێ، كە ئەوە خەڵك كردنە مەڕەو خەڵك لە مرۆڤ شۆراندنە، بەڵێ هەموو ئەوانەی چاویان لە خۆ سەپاندنە دەیانەوێ حوكمێكی ستەمكارانە بەسەر خەڵك و كۆمەڵگادا بكەن، بەرژەوەندییان لەوەدایە خەڵك بەبێ ئاگایی بمێنێتەوە، بۆیە ئەگەر لە ڕووی فیكریی و زانستییەوە، تەماشای خەڵك و كۆمەڵگای خۆمان بكەین، كایەكانی خوێندن چییان لێهاتوە! دەبینین: ئاستی خوێندن و فێربوون زۆر دابەزیوە، ئایا زانكۆیەكانی هەرێمی كوردستان، لە ڕیزبەندیی زانكۆكانی دنیادا ژمارە چەندن! هەر چۆن زۆر بەخۆماندا هەڵادەڵێین، بەڵام وانیە زۆری درۆو دەلەسەیە، ڕیزبەندیی ستانداردی جیهانیی زانكۆیەكانمان یەكجار نزمە، چونكە نێوەندەكانی خوێندنیشیان پڕكردوون لە خەڵكی گەندەڵ و پووچەڵ.

کەسێ سەرۆکی زانکۆیە، کەسێ سەرۆکی بەشە، کەسێك سەرۆکی کۆلێژە، بەپاڵ براوە بۆ ئەوێ، بە بڕوانامەیەکی تەزویر، بە تەزکیەی حیزبیی، هیچی لەباراندا نیە، هەروەك کەرتی تەندروستییش هەر وایەو، دادگاکانیش هەر وان، هەر کایەیەك تەماشای دەکەی، پڕکراوە لە گەندەڵیی، پڕ کراوە لە خەڵکی ناشایستە، چونکە ئەو عەقڵییەتەی لەپشت ئەم جۆرە حوکمڕانییە، عەقڵییەتێکی خاوەن بەزەیی و بەپەرۆش نیە بۆ خەڵك و وڵات، عەقڵییەتێکی دوور مەودوا بین نیە، عەقڵییەتێکی خاوەن ستراتیژیی نیە، بەس ئێستای لەبەر چاوە، ئێستاشی وا لەبەرچاوە کە هەرچی زووتر پارەی زۆرتر کۆبکاتەوە، هەرچی زووتر خۆی دەوڵەمەندبکات، ئەگەر نا گەنجەکانی ئێمە بۆچی سەری خۆیان هەڵدەگرن و دەڕۆن بەرەو هەندەران هەڵوەدا دەبن و ڕوو لە وڵاتانی دیکە دەکەن؟ لەبەر ئەوەی لێرە بێ کارە، بێ ئیشە، خوێندنی تەواو کردوە، بەڵام هیچ ئیش و کارێکی نیە، کێ وای کردوە؟! خەڵکی بەس بۆ ئەوەیە بەرژوەندیی خۆی پێ سازبکا، بۆ ئەوەی نین خۆیان بەختەوەربن و ئازادبن و ئازابن و لەسەر ڕێگایەکی ڕاستبن و خاوەنی کەسایەتییەکی تەندروستبن، بەڵکو دەیەوێ بەدەستی ئەوەوە بن و چی بوێ پێیان بکات و نەڵێن: لەل!!.

٤ـ هەست و هەڵوێستی گەنج، بەرانبەر بە خەڵك و مرۆڤایەتیی:

**ئەمیش بوارێکی دیکەی گرنگە، کە پێویستە گەنج و لاوی مسوڵمان هەست و بۆچوونێکی ڕاست و دروست و، هەڵوێستێکی ڕێك و پڕ بە پێستی لە بەرانبەریدا هەبێ.**

**بە سەرنجدانی چەند ئایەتێکی قوڕئانی بەرزو مەزنیش، لەو بارەوە بەرچاومان ڕۆشن دەبێتەوە:**

**١ـ** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾ **الحجرات.**

**واتە: ئەی خەڵکینە! ئێمە لە نێرو مێیەك دروستمان کردوونو، گێڕاومانن بە چەند گەل و هۆزێك تاکو پێك ئاشنابن، بە دڵنیایی بەڕێزترتان لە لای خوا، پارێزکارتانە، بێگومان خوا زانای شارەزایە.**

**٢ـ** ﴿ ۞ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ ﴾ **الإسراء.**

**واتە: بە دڵنیایی ڕێزمان لە ڕۆڵەکانی ئادەم گرتوە، لە وشکانیی و دەریادا هەڵمانگرتوون و، لە بژیوە خۆش و پەسەندەکان پێمان داون و، بەسەر زۆرێك لەوانەدا کە دروستمان کردوون، بە هەڵبژاردنێکی تایبەت هەڵمانبژاردوون.**

٣- ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾ الممتحنة.

واته: خوا لێتان قەدەغە ناكات، چاكەكاریی بكەن و دەستگرۆیی كەسانێك (لە نا مسوڵمانان) بكەن، كە لە ئایینتاندا دژایەتییان نەكردوون و، لە ماڵەكانتان وەدەریان نەناون، بە دڵنیایی خوا سامانی خۆ بەخشەرانی خۆشدەوێن.

لەم ئایەتە بە پێزانەش، ژمارەیەكی دیكە ڕاستیی گەورەو گرنگ لە بواری تێڕوانین بۆ خەڵك و مرۆڤایەتیی و، مامەڵەكردن لەگەڵیاندا، وەردەگیرێن كە ئێمە بە چەند نموونەیەكیان وازدێنین:

یەكەم: مرۆڤایەتیی بە تێكڕای گەل و نەتەوەو هۆزەكانیەوە، ڕۆڵەی باب و دایكێكن (ئادەم و حەوا)و، سەرچاوەی هەموویان خێزانێكە. كەواتە:

هیچكەس، نەوەك تاك و، نەوەك خێزان و بنەماڵەو هۆزو نەتەوە، یان ڕەگەز (جنس) بۆی نیە خۆی بەسەركەسدا هەڵكێشێ و، لافی چاكتر بوون لێبدات (الحجرات - ١٣-).

دووەم: خوای كاربەجێ و دادگەر بە مەبەستی پێك ئاشنابوون و پێكەوە هاوكاربوونی مرۆڤان، دابەشیكردوون بۆ چەند گەل و هۆزێك، كەواتە:

پێویستە هەموو لایەكیان ئاگاداری حیكمەت و ئەو ئامانجی خوای زانا و توانابێ، لەو جۆراو جۆربوونەی گەل و هۆزانەیان.

﴿ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ﴾.

سێیەم: سەنگ و مەحەك و پێوەری بەرزیی و نزمیی و چاكیی و خراپیی مرۆڤان لە لای خوا، پارێزكار (متقي) بوونیانە. كەواتە: هیچ كام لە:

ڕەگەزو ڕەنگ و زمان و ڕەچەڵەك و ماڵ و سامان و... هتد ڕەوا نیە بكرێنە مایەی شانازیی كردن و خۆ پێوە هەڵكێشانی هیچ كەس بەسەر هیچ كەس و لایەنێكدا.

﴿ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ﴾.

چوارەم: مرۆڤەكان هەموویان و بەبێ جیاوازیی، جێی ڕێزن و لە لایەن خواوە ڕێز لێگراون و، هەموو شتێك بۆ دەستەمۆ كراون و، لەوشكانی و دەریادا هەڵگیراون و، بەسەر زۆرێك لە دروستكراوانی خوادا هەڵبژێراون.

﴿ ۞ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الإسراء.

پێنجەم: مسوڵمانان لەسەریان پێویستكراوە لەگەڵ كۆی نامسوڵمانان دا ـ بێجگە لەوانەی دژی ئایین و ژینیانن ـ بە چاكەكاریی و هاوكاریی و پێبەخشینەوە مامەڵە بكەن، (الممتحنة – ٨ -)، هۆكاری ئەوەش كە لە ئایەتی ژمارە (٨)ی (الممتحنة)دا، بە (لاینهاكم الله) تەعبیر لەو مەسەلەیە كراوە، ئەوەیە كە سوورەتی (الممتحنة) لە

کەشی جەنگ و بەرەنگاربوونەوەدا دابەزیوە، مەبەستیش لە (تقسطوا إليهم) پێبەخشین و هاوکاریی مادییە، چونکە:

أ- (أقسط إليه: أعطاه قِسْطَهُ من المال)[1]. بەشەکەی خۆی پێدا لە ماڵ و سامان.

ب - هیچ کات دادگەریی (قسط) قەدەغە نیە لەگەڵ مسوڵمانان و نامسوڵمانانیشدا، تاکو پێویست بکات باسی قەدەغە نەکرانی بکرێ!

بە دڵنیاییش کەسانێك لە ڕوانگەی ئەو ئایەتە بە پێزانەوە و لەبەر تیشکی ئەو ڕاستییانەدا، سەرنجی مرۆڤایەتیی و کۆمەڵگایەکانی بەشەر بدات، بە جیاوازیی ئایین و ڕەنگ و زمان و ڕەگەزو ڕەچەڵەکەکانیانەوە، لەگەڵ تێکڕای مرۆڤاندا تەباو گونجاو دەبێ و، خۆی دوور دەگرێ لە دەمارگیریی و داخراویی و گۆشەگیریی.

---

(١) بڕوانە: (عمدة الحُفّاظ في تفسير أشرف الأفاظ) ج٣ ص٣٠٦، الشَّمين الحَلَبيّ. هەروەها بڕوانە: (بصائر ذوي التمييز في لطائف الكتاب العزيز) ج٤ ص٢٦٨، الفيروز آبادي: ( القَسْطُ: أن يأخذ قِسْطَ غيره، والإقساط: أن يُعْطيَ قِسْطَ غيره). بۆیەش (أقسط) بە (إلى) بەرکاری خواستوە لە جیاتی (ل)، تاکو مانای (تفضّل)ی پێ هەڵبگیرێ.

٥ـ هەســت و هەڵوێستی گەنــج بەرانبەر بە نەتــەوەو نیشتمانەکەی:

خۆشویستنی گەل و نیشتمان و دڵ پێ پشکوتن و پێ ئاسوودە بوونیان، هەستێکی خوارسك و زگماکە لە هەموو مرۆڤێکدا، مەگەر ناخ و دەروونی تێکچووبێ و، لەسەر دۆخی ئاسایی خۆی نەمابێ.

گەنج و لاوێکی مسوڵمانیش، وەك هەر مرۆڤێکی دیکەی ئاسایی زگماك ساغ گەل و نیشتمانی خۆی خۆشدەوێن، ئنجا گەنج و لاوی مسوڵمان کوڕبێ یان کچ، هەڵوێستیشی بەرانبەر لە گەل و نیشتمانی، بەپێی هەستیەتی بەرانبەریان و، وەك چۆن سۆزو خۆشویستن و بەتەنگەوە بوونی بەرانبەریان هەیە، هەوڵیش دەدات هەڵوێستیشی بە کردەوە هەروابێ و ئەوەی لە دڵ و دەروونیدا هەیە، هەوڵدەدات بە کردەوەو لەسەر زەوی واقیعیش بیچەسپێنێ و، بە پێی تواناو بۆلوانی کاردەکات گەل و نیشتمانەکەی بپارێزێ و ، گەلەکەی شادو ئازادو سەربەست و، نیشتمان و وڵاتەکەیشی هەردەم پاك و جوان و ئاوەدان و پڕ خێر و خۆشیی بێ.

شایانی باسیشە: کە باسکردنی گەل و نیشتمان و، سۆزو پەرۆشیی و خۆشەویستیی بۆ دەربڕینیان، بە هەموو زمانەکان هەیەو ئەو مەسەلەیە خاڵێکی هاوبەشی نێوان تێکڕای گەل

و نەتەوەکانە، ئەدەب و کلتووری سەرجەم نەتەوەکان، پڕە لە شیعرو هەڵبەست و پەخشانی بە جۆش و خرۆش لە بەرانبەر گەل و نیشتماندا، بە تایبەتییش ئەو گەل و نەتەوانەی نیشتمانیان داگیر دەکرێ و، هێزێکی دیکە خەڵك و دانیشتووانەکانی ژێر چەپۆك دەكات و دەچەوسێنێتەوە، ئەوانە هەستی نەتەوایەتیی و نیشتمانپەروەرییان لەلا بەهێزترو کڵپە سەندووتر دەبێ. کە گەلی کوردیش لە پێشەوەی ئەو گەل و نەتەوە ژێر دەستکراو و نیشتمان زەوتکراوانەوەوەیە.

بەندەش سی و پێنج ساڵ لەمەوبەر (١٩٨٥ ـ ١٩٨٦) لەو بارەوە کتێبێکم نووسیوە، هەتا ئێستا چوار جاران چاپ کراوەتەوە بە ناوونیشانی: (سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسۆنالیزم لە ڕوانگەی ئیسلامەوە)، کۆمەڵێك بنەمای شەرعیی گەورەو گرنگیشم لەو بارەوە لە ئایەتی ژمارە (١٣)ی (الحجرات) دەرهێناون، کە ئەوە دەقەکەیەتی و پێشتریش بە بۆنەیەکی دیکەوە هێنامان:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣﴾ الحجرات.

ئەمەش ئاماژەیەکی کورت، بە چەند بنەمایەك کە لەم ئایەتە بەپێزە وەردەگیرێن، لە بواری نەتەوایەتیی و نیشتمانبەروەریی دا:

یەکەم: تێکرای مرۆڤەکان بە ڕەچەڵەك لە تۆرەمەی باب و دایکێك (نێرو مێیەك)ن و، هەموویان ڕۆڵەی یەك خێزانن، کەواتە:

هیچکەس بۆی نیە لە یەکی دیکە لە ڕووی ڕەچەڵەك (النسب)ەوە خۆی بە باشتر دابنێ و، هەرجۆرە لافلێدانێك لەو بارەوە، نەفامییە و پێچەوانەو دژی قورئانە، وێڕای عەقڵ و لۆژیك.

دووەم: دابەشکرانی خەڵك، (مرۆڤایەتیی) بەسەر چەندان گەل و هۆزی جیاجیاو جۆراوجۆردا، بە مەبەستی ئاشنایی نێوان ئەو پێکهاتانەی مرۆڤایەتیی و هاوکاریی پێکەوە کردنیانە، نەك خۆ بەسەر یەکدا هەڵکێشان و، خۆ سەپاندن و ستەمکردن و، خاك و نیشتمانی یەکدی داگیرکردن.

سێیەم: گەل و نەتەوەکان لە ڕووی گەل و نەتەوە بوونیانەوە، یەکسان و وەك یەکن و، هیچ جیاوازییەکیان نیە، چونکە هەموویان بە ویستی خوا گێڕدراون بەو نەتەوانەی هەن، کەواتە: چەندە عەرەب و تورك و فارس نەتەوەن، (کورد)یش ڕاست هێندەو بێ کەم و زیاد نەتەوەیە، چونکە ئەویش وەك وان خاوەنی نیشتمان و زمان و وێژەو کلتوورێکی سەربەخۆیە، کەواتە: عەرەب و فارس و تورك و نەتەوەکانی دیکەی دنیا، چ مافێکیان هەبێ لە سەربەخۆیی و هەبوونی قەوارەی سیاسیی و مافی چارەنووس، گەل و نەتەوەی کوردیش، هەمان ئەو مافانەی هەن بێ کەم و زیاد.

چوارەم: ئەوەی لە تەرازو و پێوەری خوای کاربەجێ و دادگەردا، مایەی ڕێزو حورمەت و بایەخی مرۆڤەکانە، بریتیە لە پارێزکاریی (تقوی) "یانی: پابەندیی بە شەریعەتەوە بە هەردووك باری ئەنجامدانی

ئەركەكان و وازلێهێنانی قەدەغە كراوەكان" پارێزكارییش هەموو كەس وەك یەك دەستی دەیگاتێ، نێرو مێ، زاناو نەزان، دەوڵەمەندو هەژار، پلەدارو بێ پلە، تەمەندارو كەم تەمەن...

بۆیە گەنـــج و لاوێكی كوردســـتانیی، شتێكی ئاســـایی و چاوەڕوانكراوە لەسەر بناغــەی هەستی خۆشویستنی گەل و نیشتمانی، هەڵوێستی نەتەوە و نیشتمانپەروەرانەشی هەبێ.



٦ـ هەست و هەڵوێستی گەنج بەرانبەر بە ئۆممەتەکەی:

ئۆممەتی ئیسلام لە کۆی گەل و نەتەوە مسوڵمانەکان پێکهاتووەو، گەل و نەتەوە مسوڵمانەکان بە گشتیی، هەموویان وەك یەك پێکهێنەری ئۆممەتی ئیسلامن، بێ کەم و زیاد، ئنجا لە ڕاستیدا ئۆممەتی ئیسلام، بەبێ تێکڕای ئەو نەتەوەو گەلە مسوڵمانانەی لێیان پێکهاتوە، دەبێ بە ناوێکی بێ نێوەڕۆك (إسم بلا مسمى) بۆیە پێویستە مسوڵمانان وریابن و، بە هۆی هەست و سۆزی نەتەوایەتیی و نیشتمانپەروەرییەوە، کە بەبێ ویستی ئازادانەی خۆیان پەیدابووە، ئاگایان لە ئۆممەتەکەیان و دۆستایەتیی کردنی و مشوورلێخواردنی نەبڕێ، چونکە دۆستایەتییان بۆ ئۆممەت (الولاء للأمة) هەڵقوڵاوی قەناعەت و ویستی ئازادانەی خۆیانە و، وەك سەرپێبوونیان بۆ گەل و نیشتمان (الإنتماء للشعب والوطن) نیە، کە لە دەرەوەی ویستی خۆیانەوە پەیدا بووبێ و، هەستێکی زگماك و خوارسکیش بێ!

بە سەرنجدانی چەند ئایەتێکیش، مەسەلەی هەست و هەڵوێستی گەنج و لاوی مسوڵمان، بەرانبەر بە ئۆممەتەکەی ڕۆشنتر دەبێ:

١ـ ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ٩٢ ﴾ الأنبياء.

واتە: ئەم کۆمەڵەتان یەك کۆمەڵەو، منیش پەروەردگارتانم، دە جا بەس من بپەرستن.

ئەم ئایەتە موبارەکەش دوای ناوهێنانی حەڤدە (١٧) لە پێغەمبەران و گێڕانەوەی بەشێك یان پوختەیەك لە بەسەرهاتی هەندێکیان، کە ئەمانەن:

(موسی، هارون، إبراهیم، إسحاق، یعقوب، لوط، نوح، داوود، سلیمان، أیوب، إسماعیل، إدریس، ذالکفل، ذالنون (یونس)، زکریا، یحیی، عیسی (إبنها)، ئنجا خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ئەم ئۆممەت و کۆمەڵەتان یەك کۆمەڵەو، منیش پەروەردگارتانم دە جا من بەپەرستن.

کەواتە: ئۆممەتی ئیسلام ئەو کۆمەڵەیە کە ڕەگ و ڕیشەی بە قوڵایی مێژوودا چۆتە خوارو، پێغەمبەرانی هەڵبژاردەی خواش "علیهم الصلاة والسلام" سەرقافڵەو پێشڕەوینی.

٢ـ ﴿ وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱتَّقُونِ ﴿٥٢﴾ ﴾ المؤمنون.

واتە: ئەم کۆمەڵەشتان یەك کۆمەڵەو، منیش پەروەردگارتانم دەجا پارێزم لێ بکەن.

ئەم ئایەتەش دوای ناوهێنانی هەرکام لە:

نوح، موسی، هارون، ابن مریم، هەروەها ئاماژەکردن بە پێغەمبەرانێکی دیکەی زۆری بەدوای یەکدا هاتوو، هاتوەو

ڕووکراوەتە مسوڵمانان و، ئاگادارکرانەوە کە کۆمەڵ (أمة)ی ئەوان، ئەو کۆمەڵەیە کە پێغەمبەران سەرقافڵەین.

٣ـ ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴾ البقرة.

واتە: ئاوا بەو شێوەیە گێڕاومانن بە کۆمەڵێکی میانجیی، تاکو ئێوە شایەدو چاودێربن بەسەر خەڵك (مرۆڤایەتیی)ەوەو، پێغەمبەریش بەسەر ئێوەوە شایەدو چاودێربێ...

کەواتە: سەرەکییترین و زەقترین دروشم و نیشانەی ئۆممەتی ئیسلام، کە پێغەمبەرانی خوا بە گشتیی "علیهم السلام"و موحەممەد بەتایبەتی "صلی الله علیه وسلم" سەرقافڵەو سەرپەرشتیارنی، ئەوەیە کە میانجیی (وسط)ە، نە کورتی دێنێ و نە تێدەپەڕێنێ، نە زێدەڕۆییکارەو نە کەمتەرخەمە، نە توندڕەوەو نە شلڕەو، بەڵکو شەرعڕەوە.

ئەرکیی ئەوەیە بەسەر مرۆڤایەتییەوە چاودێرو شایەدبێ، یانی:

چاودێری بێ لانەدات و، بەڵگەو شایەدی ڕاستیی و تێرو تەواویی ئایین و بەرنامەی کۆتایی خواش بێ، بە هۆی بەرجەستەکردنی و جێبەجێکردنیەوە بە باشترین شێوە، وەك چۆن پێغەمبەری کۆتایی خوا موحەممەد بەسەر ئۆممەتەکەیەوە چاودێرو شایەدو بەڵگەیە، چاودێرە کە لە ڕاستەڕێ لانەدات و، بەڵگەو شایەدی ڕاستیی و تەواویی ئایین و پەیامی خواشە، بەسەریەوە.

٤- ﴿ كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ ﴾ آل عمران.

واتە: ئێوە باشترین کۆمەڵن بۆ خەڵك ڕەخسێنراون، فەرمان بە هەرچی پەسەندە دەکەن و، ڕێگریی لە هەرچی ناپەسەندە دەکەن و، بڕواش بە خوا دێنن...

بەڵێ ئەرکی گەورە و گرنگی ئۆممەتی موحەممەد "صلی الله علیە وسلم" ئەوەیە کە هەرچی چاکە و پەسەندە، لە هەموو بوارێکدا، بیچەسپێنێ و هەرچی خراپەو ناپەسەندە، بژاری بکات و ڕیشەکێشی بکات.

هەڵبەت ئیمان بەخوا هێنان بناغەی چاکە چەسپاندن و خراپە لابردنە، بەڵام بۆیە خراوەتە دوایان، تاکو بزانرێ ئیمان بە خواهێنان، کاتێك ئیمانە، کە خاوەنەکەی بەو جۆرە لێبکات: چەسپێنەری چاکەو ڕیشەکێشەری خراپەبێ.



٧ـ هەست و هەڵوێستی گەنج بەرانبەر بە کۆمەڵگایەکەی:

**بوارێکی دیکە کە هەست و هەڵوێستی گەنج و لاوی مسوڵمانی لە بەرانبەردا پێویست دەبێ، هەستێکی ڕاست و ڕێك و، هەڵوێستێکی پڕ بە پێست، بریتیە لە مامەڵەی لەگەڵ کۆمەڵگاو دەوربەریدا.**

**چونکە گەنج و لاوی مسوڵمان وێڕای خۆی، خواو خەڵکیش دەبینێ و، وێڕای دنیا، دوارۆژیش لەبەرچاو دەگرێ و، بەرانبەر بە کۆمەڵگاو خەڵکەکەی، هەست بە بەرپرسیارێتیی دەکات و، خۆی لەبەرانبەریاندا بە بەرپرسیار دەزانێ و، دەزانێ خوا لێپرسنەوەی لەو بارەوە لەگەڵ دەکات.**

**با سەرەتا لەوبارەوە سەرنجی چەند ئایەتێکی قورئان بدەین:**

**١ـ** ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ **آل عمران.**

**واتە: با کۆمەڵێکتان هەبێ، بانگەواز بۆ لای چاکە بکەن و فەرمان بە هەرچی پەسەندە بکەن و، ڕێگریی لە هەرچی ناپەسەندە بکەن و تەنیا ئەوانەش سەرفرازن.**

**٢ـ** ﴿ وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ أُولَٰئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ ﴾ **التوبة.**

واتە: پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕواداریش، هەندێکیان دۆست و پشتیوانی هەندێکیانن، فەرمان بە هەرچی پەسەندە دەکەن و، ڕێگریی لە هەرچی ناپەسەندە دەکەن و، نوێژ بەرپا دەکەن و، زەکاتێ دەدەن و، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئا ئەوانەن خوا بەزەیی پێیاندا دێ، بە دڵنیایی خوا زاڵی کارزانە.

٣- ﴿ لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: بە دڵنیایی خوا چاکەی لەگەڵ بڕواداراندا کرد، کە لە خودی خۆیان پێغەمبەرێکی بۆ ناردن، ئایەتەکانییان بەسەردا دەخوێنێتەوەو پاك و چاك (تزكية) یان دەکات و، کتێب و حیکمەتیان فێردەکات، بە دڵنیاییش پێشتر لە گومڕاییەکی ڕۆشندا بوون.

لەم ئایەتە بە پێزانەش ئەم ڕاستییانە وەردەگرین:

یەکەم: پێویستە لە نێو مسوڵماناندا هەمیشە "بەلای کەمەوە" کۆمەڵێك هەبن بانگەواز بۆ لای هەرچی خێرو چاکەیە بکەن و، فەرمان بە هەرچی پەسەندە بکەن و، هەرچی ناپەسەندیشە ڕێگریی لێبکەن، تەنیا ئەوانەش کە ئەو سێ ئەرکە گەورەو گرنگە ئەنجام دەدەن لە کۆمەڵگاکەیاندا، سەرفرازو براوەن.

دووەم: بڕوادارانی پیاو و ئافرەت، دۆست و پشتیوانی یەکدین و هاوکار و دەسبارگری یەکدین، بۆ ئەنجامدانی شەش ئەرکی گەورەو بنەڕەتیی:

١و٢: فەرمانکردن بە پەسەندو ڕێگریی کردن لە ناپەسەند.

٣و٤ : نوێژ بەرپاکردن و زەکات دان.

٥و٦: فەرمانبەریی کردن بۆ خوا عز وجل و پێغەمبەرەکەی "صلی الله علیه وسلم".

هەڵبەت (المعروف) و (المنکر) کە هەردووکیان بە ئەلیف و لامی ناساندن (أل التعریف) ناسێنراون، کە بۆ تێکڕا (جنس)یەو تێکڕا (جنس)ی پەسەند و ناپەسەندەکان دەگرنەوە، لە هەموو بوارەکانی:

تێڕوانین و فیکر و ئیمان و عەقیدە و، پەرستش و، ڕەوشت و ئاکار و، کارو کاسبیی و بازرگانیی و، کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و...هتدا.

کەواتە: گەنج و لاوی مسوڵمان، پێویستە زۆر وریاو چوارچاوبێ بەرانبەر بە کۆمەڵگاو خەڵکەکەی و، هەمیشە چاوی لەسەریان بێ و، هەر پەسەند (معروف)ێکی بینی لە هەربوارێکدا کە پشتگوێ خراوەو، هەر نا پەسەند (منکر)ێکی دی لە هەر بوارێکدا، لە واقیعدا چەسپاوە، یان برەو و ڕەواجی پێیدراوە، بە پێی تواناو بۆ لوانی، مشووری چەسپاندنی پەسەندەکە بخوات و، کاریش بۆ لابردنی ناپەسەندەکە بکات.

هەروەها بۆ بەرپاکردنی نوێژو زەکات دان و، فەرمانبەریی کردنی خواو پێغەمبەریش، بە هەمان شێوە، پێغەمبەری خواش "صلى الله علیه وسلم" هەر لەو سیاقەدا فەرموویەتی: (أَلاَ كُلُّكُمْ راعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ...)[1].

واتە: ئاگاداربن! هەرکامێکتان چاودێرو بەرپرسیاریشە بەرانبەر بە خەڵکەکەی خۆی..

سێیەم: گەنج و لاوی مسوڵمان - چ کوڕ چ کچ - کە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد "صلى الله علیه وسلم" مامۆستاو چاوساغ و سەرمەشقییەتی، وەك خوای تاك و تەنیا فەرموویەتی:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: بە دڵنیایی لە پێغەمبەری خوادا سەرمەشقییەکی باش هەیە، بۆ هەر کەسێك کە بە ئومێدی خواو ڕۆژی دوایی بێ و زۆریش یادی خوا بکات.

پێغەمبەری خواش "صلى الله علیه وسلم" خوای نیزیك و وەڵامدەرەوە (قريب مجيب) لە چوار ئایەتی قورئاندا، کە دووانیان مەککەیین: (الأنعام - ١٤٥ - و النحل - ١١٥ -)و دووانیشیان مەدینەیین: (البقرة - ١٢٩ - و المائدة - ٣ - )، ئەرکەکانی لە چوار شتاندا کورت هەڵهێناون، کە بریتین لە:

---

(١) متفق علیه، أخرجه البخاري: ٨٩٣، ومسلم: ١٨٢٩.

١ـ خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا (يتلوا عليهم آياته).

٢ـ پاك و چاككردنیان (ويزكيهم).

٣ـ کتێب فێرکردنیان (ويعلمهم الكتاب).

٤ـ حیکمەت فێرکردنیان (... والحكمة).

کەواتە:

گەنج و لاوانێکیش کە خۆیان بە شوێنکەوتووی ئەو پێغەمبەرە پێشەوایە "صلى الله عليه وسلم" دادەنێن، پێویستە وەك پێغەمبەرەکەیان، هەوڵبدەن لە قەدەر خۆیان ئەو چوار ئەرکە گەورەو گرنگە، لە کۆمەڵگاو دەوروبەری خۆیاندا جێ بەجێ بکەن، واتە:

ئایەتە بەپێزەکانی کتێبی بەرزو مەزنی خوا، بەسەر خەڵك و کۆمەڵگایەکەیاندا بخوێننەوەو، چەمك و مەبەستەکانیشیان بۆیان ڕوون بکەنەوە.

چونکە بە دڵنیایی مەبەست لە خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا بەسەر خەڵکیدا، تەنیا خوێندنەوەی ڕووت نیە، بەڵکو مەبەست خوێندنەوەیان و شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی واتاکانیشیانە.

هەڵبەتە خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئانیش بە لێحاڵیبوونەوە، بناغەی کۆی دینداریی و مسوڵمانەتییە، بە هەموو بوارو ڕەهەندەکانیەوە، چونکە هەرکام لە تەزکیەکردن و فێرکردنی کتێب و حیکمەتیش، هەر لە ئایەتەکانی قورئانەوە هەڵدەقوڵن و، بەسەردا

خوێندرانەوەی ئایەتەکان، هەرکام لە پاك و چاککردن و فێرکردنی بەرنامەو حیکمەتیش دەگرێتە خۆی.

بەڵێ خوێندنەوەی ئایەتەکان، بناغەی مسوڵمانەتییەو، یەکەمین هەنگاوی مامەڵەی ڕاست و دروستە لەگەڵ کۆمەڵگاو دەروبەردا.

مەبەستیش لە پاك و چاککردن (تزكية) کارکردنە لەسەر دەروونی خەڵك، بە مەبەستی پاڵفتەو بژارکردنی لە خشپ و خاڵی سیفەتە خراپەکان و ڕازاندنەوەی بە خەسڵەتە بەرزو پەسەندەکان و، سەرەنجام گەشەپێدانی دیوی نێوەوەی مرۆڤ و لایەنی ڕووحیی و مەعنەویی و، هەرچیی پتر شایستەکردنی بۆ لە خوا نزیکبوونەوە.

مەبەستیش لە فێرکردنی کتێب و حیکمەت (تعليم الكتاب والحكمة)ش شارەزاکردن و بەرچاو ڕوونکردنەوەی خەڵکە، لەبارەی بەرنامەی خواو یاسا شەرعییەکانەوە کە: چاك و خراپ و، ڕاست و چەوت و، حەڵاڵ و حەڕام و، شیاو و نەشیاو، ڕوون دەکەنەوە.

واتە: مەبەست لە فێرکردنی کتێب و حیکمەت، فێرکردنی قوڕئان و سوننەت نیە، وەك زۆربەی هەرە زۆری ڕوونکەرەوانی قوڕئان گوتوویانە!

چونکە خوێندنەوەی ئایەتەکان، هەمان فێرکردنی قوڕئان و کتێبی خوایە و، پێشتر باسکراوە، (حیکمة) یش نە لە قوڕئان و سوننەتدا و، نە لە زمانی عەرەبییشدا، بە مانای (سنة) نیە، بە زۆر بەڵگان، بۆ وێنە:

١ـ ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ﴾ لقمان.

واتە: بێگومان حیکمەتمان بە لوقمان بەخشیبوو.

بەدڵنیایی لوقمان پێغەمبەر نەبووەو، سوننەتی پێغەمبەرایەتییشی نەبووە.

٢ـ (لَا حَسَدَ إِلاَّ فِي اثْنَتَيْنْ: ... ورَجُلٌ آتاهُ اللهُ الْحِكْمَة، فَهْوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُها...)[١].

واتە: خۆزگە پێخواستن لە دووشتاندا هەیە: ... هەروەها پیاوێك خوا حیکمەتی پێداوە، ئەویش کاریشیی پێ دەکات فێر (خەڵك) یشی دەکات...

کەواتە: حیکمەت بە جگە لە پێغەمبەرانیش دراوە و دەدرێ.

٣- ﴿ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِىَ خَيْرًا كَثِيرًا ﴾ البقرة.

واتە: هەرکەس حیکمەتی درابێتێ چاکەیەکی زۆری پێدراوە....

بەڵکو حیکمەت یانی:

لێزانیی و کارامەیی ، زانینی هەق و کارپێکردنی، کە لەم چوار ڕەوت و (سیاق)ەدا، کە چوار ئایەتەکانی باسی چوار ئەرکە سەرەکییەکەی پێغەمبەری خوا هێناویانن، بە مانای لێزانین و کارامەیی، لە جێ بەجێکردنی کتێب و بەرنامەی خوادایە.

---

(١) البخاري: ٧٣، ومسلم: ٨١٦.

پوختەی مەبەست:

گەنج و لاوی مسوڵمان بە عەقڵ و دڵ، هەست بە واقیعی کۆمەڵگایەکەی خۆی دەکات و، لەگەڵ خۆشیی و ناخۆشییەکانیدا کارلێك (تفاعل) دەکات و، بە هەموو توانایەوە هەوڵدەدات و کاردەکات بۆ پاك و خاوێن ڕاگرتنی کۆمەڵگایەکەی و، پاراستنی لە لادان و تاوان و، ئاوەدانکردنەوەی و ڕازاندنەوەی بە هەرچی پەسەندو چاکە لە هەموو ڕووێکەوە، هەڵبەت خراپترین دوو شت کە دەبێ کۆمەڵگایان لێ بژار بکرێ: هاوبەش بۆ خوا دانان و ستەمکاریی (الإشراك بالله و الظلم)ن و، باشترین دوو شتیش بریتین لە خوا بەیەکگرتن و دادگەریی (التوحید والعدل)، هەر بۆیە خوای کارزان و دادگەر، چەسپاندنی خوا بە یەکگرتن و دادگەریی، کردوون بە ئامانجی بنەڕەتیی ڕەوانەکردنی تێکڕای پێغەمبەرانی خۆی، وەك لەبارەی تەوحیدەوە فەرموویەتی:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾ ﴾ الأنبياء.

واتە: لە پێش تۆشدا "ئەی موحەممەد!" هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە مەگەر سروشمان بۆ لای کردوە کە جگە لەمن هیچ پەرستراوێك نیە، ئنجا بەس من بپەرستن.

هەروەها لەبارەی دادگەرییەوە فەرموویەتی:

﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ۖ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ ۚ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٢٥﴾ ﴾ الحديد.

واتە: بە دڵنیایی پێغەمبەرانی خۆمانمان بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوە ناردوون و کتێب و تەرازووشمان لەگەڵیاندا دابەزاندوون تاکو خەڵك بە دادگەریی هەڵسن و ئاسنیشمان دابەزاندوە هێزێکی توندو سوودگەلی تێدان بۆ خەڵك و بۆ ئەوەی خواش بزانێ کێ خۆی و پێغەمبەرانی بە پەنامەکیی سەردەخات! بێگومان خواش بەهێزی زاڵە.



## دەستپێك

سەرچاوەی سەرەکیی زۆربەی هەرە زۆری گرفت و کێشەکانی گەنج و لاوان لە هەرێمی کوردستان و عێراقیشدا، ئەو شێوە حوکمڕانیی و ئیدارەدانە سەقەتە، حیزبیی و بنەماڵەییە پڕ ستەم و گەندەڵیی و پۆخەڵەیە، کە سیی (٣٠) ساڵ زیاترە خۆی بەسەر ئەو خەڵك و وڵاتەدا سەپاندوە، چونکە خۆی کردۆتە هەمە کارەی وڵات و خەڵك و، بە حیساب و بەڕووکەشیی هەرسێك دامەزراوەکانی: حکوومەت و پەڕلەمان و دەستەڵاتی دادگەریی هەن، بەڵام بە ڕاستیی و لە واقیعدا هەموویان لە نێوەڕۆك خاڵیی کراونەوەو، ماوەنەوە ناوی ڕووت و بۆش.

هەروەها هەڵسووڕێنەرانی، قەوارە سیاسییەکەی هەرێم، وەك تێکڕای هێزە خۆ سەپێنەرەکانی ئێستاو ڕابردوو، لە ماوەی سیی (٣٠) ساڵی ڕابردوودا، کاری جیددیی کردوە، کە هەمیشەو بەردەوام بە هەر نرخێك بووەو بە هەر شێوەیەك بووە هەرسێك دەستەڵاتی: سیاسیی و ئابووریی و ڕاگەیاندن، لە دەستی خۆیدا قۆرخ بکات، کە ئەوە عادەت و پیشەی لە مێژینەی سەرجەم هێزو دەستەڵاتە خۆسەپێن و ستەمکارەکان بووە، هەربۆیەش خوای زاناو تواناو دادگەر لە قورئاندا، زۆر باسی سێکوچکە (ثالوث)ی: (فیرعەون، قارووون، هامان)ی کردوە، چونکە فیرعەون هێمای خۆسەپاندنی

سیاسیی (الإستبداد السياسي)و، قاڕوون هێمای بەهرەی خراپ وەرگرتنی ئابووریی (الإستغلال الإقتصادي)و، هامانیش هێمای چەواشەکاریی و گەوجاندنی ڕاگەیاندنیی (الإستجهال و الإستحمار الإعلامي)، بوون.

بەڵێ بەهرەی خراپ وەرگرتنی حوکمڕانە ستەمکارەکان لە خاڵە بێهێزەکانی مرۆڤ: ترساندن و برسییکردن و چەواشەکردن (التخويف والتجويع والتضليل) چەکی بەهێزی دەستیان بووەو، بە پێچەوانەوەش پێغەمبەران "عليهم السلام" جەختیان لەسەر بەهێزکردنی خاڵە بەهێزەکانی مرۆڤەکان، کە پێیان بوونە مرۆڤێکی ڕێزلێگیراو لە لایەن خواوە، کردۆتەوە بە پلەی یەکەم: بەهێزکردنی عەقڵ و هۆشیان، بە زانیاریی و شارەزایی بەرانبەر بە خۆیان و خواو گەردوون و، بەهێزکردنی دڵ و دەروونیان بە هۆی ئیمان و تەقواو تەزکیەوە.

ئێستاش با لە دوو بڕگەی پوخت و گوشراودا، چەند قسەیەك بکەین لەبارەی بەشێك لە گرفت و کێشەکانی گەنج و لاوەکانمان، لە هەرێمی کوردستان و عێراقداو، چۆنیەتیی و نەخشەڕێی چارەسەرکردنی ئەو گرفت و کێشانەش:

برگەی یەکەم: هەندێك لە گیروگرفتەکانی گەنج و لاوانی

هەرێمی کوردستان:

بێگومان گیرو گرفتەکانی گەنج و لاوانی هەرێمی کوردستان، زۆرن و بەردەوامیش لە زێدە بوون دان، بەڵام ئێمە هەوڵدەدەین ئاماژە بە بەشێکیان بکەین، کە پێم وایە گرنگترینیانن:

**١- نەبوونی قەوارەیەکی سیاسیی جێی متمانەو ئومێد:**

پێم وایە ئەمە لەم ڕۆژگارەدا گرفتی هەرە گەورەی گەنج و لاوی کوردستانییە، چونکە بێگومان هیچ کۆمەڵگایەك بێ گرفت و کێشە نابێ، بەڵام کاتێك خەڵك و جەماوەر بە گشتیی و بەتایبەتی چینی گەنج و لاو، متمانە و ئومێدی بە قەوارە سیاسییەکەی خۆی دەبێ، ئەو متمانەو ئومێدە خۆڕاگریی و پشوو درێژیی پتری پێ دەدات، لەبەرانبەر گرفت و کێشەکانیدا، چونکە چاوەڕێ دەکات کاتێك بێ قەوارە سیاسییەکەی لە فریای بێ و دەستی بگرێ و هاوکاریی بکات، بەڵام کاتێك لە خێرو چاکەی قەوارەکەی نائومێد دەبێ و متمانەی پێی نامێنێ، ئەوە بۆی دەبێتە گرفت و ناسۆرێکی بێڕەزا، هەربۆیەش لە ڕابردوودا، خەڵکی هەرێم بە گشتیی و بەتایبەت گەنجان، خۆڕاگریی و حەوسەڵەیان لەسەر نارەحەتییەکان زیاتر بوو، بەڵام دوای ئەوەی هیچ ئومێدو متمانەیان بە قەوارەکەیان نەما،

بە هۆی بەڵێنی درۆی زۆرەوە، بۆ نموونە: پاشەکەوتکردنی مووچە، کە دوایی دەرکەوت جگە لە خەڵەتاندن و فریودان، شتێکی دیکە نەبوو! هیچ حەوسەڵەیان نەماو پەتی خۆڕاگرییان پچڕا!

**٢ـ هەبوونی ستەمێکی زۆری سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی:**

هەبوونی ستەمی سیاسیی کەڵەکە بووی چەندان ساڵەو، دیاردەی قڕیی و پڕیی و چینایەتیی بێڕەزای، نێوان کەمینەیەکی ملیارلێری حیزب و خزم و، زۆرینەیەکی ڕەش و ڕووتی بەشخوراو و، لێك دابڕانێکی کۆمەڵایەتیی زەق، کە بە کردەوە کۆمەڵگای بۆ دووبەشی جیاوازو لە هەموو شتێك لەیەك جیا دابەشکردوە، بەڵێ هەبوونی ئەو حاڵەتە پڕ ستەمە نا هاوسەنگەش لە هەموو کایەکانی ژیان و گوزەراندا، بە تایبەت: سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی، یەکی دیکەیە لە گیروگرفتە گورچکبڕەکانی گەنج و لاوەکانمان، کە تەواو پشووی پێ سوارکردوون و سەغڵەتی کردوون.

پێویستیشە دڵنیاو مسۆگەر بین، کە ستەم (ظلم) ڕووخێنەرو لەبن هێنەری کۆمەڵگایەکانەو، خوای دادگەر لە چەند ئایەتێکی قورئانە مەزنەکەیدا، ئەو ڕاستییەی وەك یاسایەکی خۆی لە ژیانی بەشەردا بۆ خستووینە ڕوو:

أـ ﴿ وَتِلْكَ ٱلْقُرَىٰٓ أَهْلَكْنَٰهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِدًا ﴿٥٩﴾ ﴾ الكهف.

واتە: ئەو ئاوەدانییانەمان فەوتاندن، کاتێك ستەمیان کردو، بەڵێنگەشمان بۆ فەوتاندنەکەیان دانابوو.

ب ـ ﴿ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ القصص.

واتە:ئێمەش فەوتێنەری ئاوەدانییەکان نابین،مەگەر خەڵکەکەیان ستەمکاربن.

ج- ﴿ وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿١١﴾ ﴾ الأنبياء.

واتە: زۆر ئاوەدانییمان کە ستەمکاربوون، پشت شکاندوون و، دوای وان کۆمەڵێکی دیکەمان پێگەیاندوون.

پێشم وایە:

ستەمە سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییە زل و بێڕەزا و زەقەکەی هەرێم، کە لە لایەن کەمینەیەکی ستەمکاری مشەخۆرەوە، کراوەتە پیشە، ڕۆژ بۆ ڕۆژی تەمەنی هەرێمەکە کورتتر دەکات و، پتر بەرەو پووکانەوەی دەبات و، زۆرجاریش و لە مێژیشە ئاسۆی تاریك و تەڵەمی چاوەڕوانکراوی هەرێمم دڵسۆزانەو وەك هۆشدارییەك بە گوێی هەمووﻻیەکدا داوە، بەڵام بە داخەوە کەمینە حوکمڕان و خۆشگوزەرانەکە، بە دەستەڵاتی موزەییەف و پارە حەڕامەکەی سەرخۆش و بێهۆش بووەو، زۆرێکیش لە خەڵکی پشتگیرییکەری ئەو حوکمڕانە کەمینەیە، بە تۆزە ئیمتیازێکی

ماددیی و مەعنەویی پێدراویان، بە لە خشتە براویی و بەنج کراویی، بێهەست و نەست و بێ هەڵوێست کراون و، زۆرینەیەکیش لە خەڵك "کە بە پێی هەڵبژاردنەکانی ئەم دواییە بە ٧٥٪ مەزەندە دەکرێ" بە بیانووی نارازییبوونی لە بارودۆخ، کەوتۆتە حاڵەتی بایکۆت و مانگرتنەوە، کە هەتا ئێستا هەر دەستەڵاتی ستەمکارو گەندڵکار لە هەڵوێستەکەیان بەهرەمەندە!

### ٣- ڕەشبینیی و بێ هیوابوون:

ئەمیش یەکێکە لە گرفت و نەخۆشییە کوشندەکانی ژمارەیەکی زۆر گەنج و لاوانی هەرێمی کوردستان، کە لە ئەنجامی بینینی واقیعێکی پڕ ستەمی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و ئەمنیی چەند ساڵەو درێژ خایەندا، لە لایەك و، لە لایەکی دیکەشەوە: نا ئومێدبوون لە چارەسەرکردنی واقیعەکەو، هاتنە مەیدانی کەسانێکیش کە دروشمی زۆریان بەرزکردنەوە، بەڵام نەك هەر نەیانتوانی بیانکەنە کردار، بگرە بە پێچەوانەشیانەوە ڕەفتاریان کرد، هەروەها هاتنە مەیدان و خۆڕانانی کەسانێکیش کە جگە لە قسەی زرق و برق ق فریودەرانە کردن و، هەراو گاڵەگاڵی ڕاگەیاندن و، هەموو کەس و لایەك زەربی سفرکردن و، قسەی خۆش و بۆشکردن و، بە کردەوەش هەروەك حوکمڕانە ستەمکارەکان کردن و، پێ نەبوونی هیچ پرۆژەیەکی سیاسیی و فیکریی و پەروەردەیی، بەڵێ لە ئەنجامی ئەو هۆکارانەو

هۆکارانێکی دیکەشدا، گەنج و لاوانێکی زۆر تووشی ڕەشبینیی و نائومێدیی بوون، کە بەدڵنیاییەوە مرۆڤی بڕوادار هەرگیز بێهیوایی زەفەر بە دڵ و دەروونی نابات، وەك خوای پەنهانزان فەرموویەتی:

﴿ إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾﴾ یوسف: ٨٧.

واتە: بە دڵنیایی جگە لە کۆمەڵی بێبڕوایان، هیچکەس لە فەرەحنایی و دەرووی خێری خوا نائومێد نابێ.

بەڵام کاتێك مرۆڤ دەکەوێتە دۆخێکی دژوارو سەختەوەو، بەهۆی خواناسی و ئیمانیشەوە عەقڵ و دڵی ڕۆشن نەبووبێتەوە، بێگومان تەمی نائومێدیی و ڕەشبینیی باڵی ڕەشی بەسەردا دەکێشێ و، لە جلێتاوی گەلێك دەردو نەخۆشیی کوشندەی هەڵدەکێشێ!.

### ٤ـ خۆ لێونبوون و سەرگەردانیی و ڕێ دەرنەکردن:

بێگومان مرۆڤ هەرکات پەیوەندیی بە خواوە نەماو لە خوا دابڕا، سەری لە پووچگەرایی (عبثية)وە دەردەچێ و، خۆی لێ ون دەبێ و، لە گەردووندا سەرگەردان و، بێ سەروشوێن دەبێ، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿١٩﴾﴾ الحشر.

واتە: هەروەها وەك كەسانێك مەبن، كە خوایان لەبیر چوو، خواش خۆیانی لەبیربردنەوە، ئا ئەوانەن لاڕێیان.

بەڵێ مرۆڤ بە هۆی بێ ئیمانییەوە، سەرگەردان دەبێ و، خۆی لێ ون دەبێ و نازانێ:

چییەو، كێیەو، لە كوێوە هاتوەو، كێ هێناویەتی و، بۆچی و، بۆ كوێ دەچێ؟!

هەربۆیەش خوا میهرەبان لە بارەی كاریگەریی ئیمانەوە، لە ژیانی مرۆڤدا، كە هۆكاری بەرچاو ڕوونیی و ڕێی ڕاست گرتنیەتی، فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهۡدِيهِمۡ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمۡۖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٩﴾ ﴾ یونس.

واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان هێناوەو كردەوە چاكەكانیان كردوون، پەروەردگاریان بە هۆی ئیمانەكەیانەوە ڕستەڕێیان دەكات، ڕووبارگەل بە ژێر (كۆشكەكان)یاندا دەڕۆن، لە باخە پڕ نازو نیعمەتەكاندا.

مایەی داخ و خەفەتی زۆریشە، كە ژمارەیەكی زۆر لە گەنج و لاوەكانمان لە هەرێمی كوردستاندا، بە هۆی لە دەستدانی ئیمان یان كاڵبوونەوەو كزبوونیەوە، گیرۆدەی حاڵەتی سەرگەردانیی و خۆ ونكردن و پووچگەرایی بوون و، ئەو حاڵەتەش ماك و میكرۆبی

ژمارەیەکی زۆر لە گرفت و دەردە دەروونیی و کۆمەڵایەتییەکانە، وەك:

ڕەشبینیی، نائومێدیی، دڵە ڕاوکە، باوەڕ بەخۆ نەمان...

ئنجا لە ئەنجامی ئەو نەخۆشیی و گرفتە دەروونیی و کۆمەڵایەتییانەوەشدا، کۆمەڵێك ڕەفتارو هەڵوێستی خراپ پەیدا دەبن، وەك:

جۆرەکانی لادان و تاوان، مەیخۆریی، خۆ کوژیی، سەری خۆ هەڵگرتن...

**٥ـ بێکـــــاریی:**

بێکاریی و نەبوونی ئیش و کار، یەکی دیکەیە لە گرفت و کێشەکانی گەنج و لاوانی هەرێمی کوردستان، بە تایبەت بۆ کەسانێك کە ساڵانێکی زۆر خوێندوویانە و خوێندنیان تەواو کردوە، بەڵام دوایی ئیش و کارێکیان چنگ ناکەوێ هەواری ژیان و گوزەرانی خۆیانی پێ سازبکەن.

هۆکارێکی سەرەکیی نەبوونی ئیش و کاریش، بۆ ژمارەیەکی زۆری گەنجان، بریتییە لە هێنرانی ڕێژەیەکی زۆر کرێکاری بیانیی لە لایەن ژمارەیەك لەو کۆمپانیایانەوە کە ڕاستەوخۆ هی بەرپرسە گەندەڵەکانن، یان هی شەریکە دزەکانیانن، تاکو کاری زۆریان پێ بکەن و، کرێی کەمیان پێبدەن!

یەکێك لە دەرهاویشتە خراپەکانی بێکارییش، ئەوەیە کە بابای گەنج "کوڕ" پارەیەکی بەدەستەوە نابێ، بە هۆیەوە بیربکاتەوە لە هاوسەرگیریی و، جێگاو ڕێگایەك بۆ خۆ دابینکردن و حاڵ و ماڵ پێکەوە نانێك.

**٦ـ هــەژاریــی :**

ئەمیش گرفت و کێشەیەکی دیکەی گەورەی گەنج و لاوەکانمانەو، ڕاستەو خۆش دەرهاویشتەی گرفتی پێشوویە.

شایانی باسیشە: هەژاریی و ئاتاجیی، یەکێکە لەو بەڵاو مەینەتییانەی پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" لەگەڵ کوفردا جووتی کردوەو، پەنای لێ بە خوا گرتوون، وەك فەرموویەتی:

(أللهم إِنِّي أَعُوْذُ بِكَ مِنَ الْفَقْرِ وَالْكُفْرِ)[١].

واتە: ئەی خوایە: من پەنات دێنمە بەر لە هەژاریی و بێبڕوایی.

پێویستیشە بزانین کە پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" زۆر ڕقی لە سواڵکردن و داواکردنی هاوکاریی لە خەڵك بووە، جگە لە چەند حاڵەتێکی دەگمەن و هەڵاوێردراو، بە پێچەوانەوەش زۆر حەزی لە کارکردن و ڕەنجدان بووە، وەك لەم دوو فەرمایشتەیدا دیارە:

---

(١) صحيح أبي داود:٥٠٩٠.

أ ـ (ما يَزَالُ الرَّجُلُ يَسْأَلُ النَّاسَ، حتَّى يَأْتِيَ يَومَ القِيَامَةِ ليسَ في وجْهِهِ مُزْعَةُ لَحْمٍ)[١].

واتە: کەسی وا هەیە ئەوەندە لەسەر سواڵکردن لە خەڵك بەردەوام دەبێت، هەتا کە لە ڕۆژی قیامەتدا دێ، یەك پارچە گۆشتی بە دەم و چاوەوە نەماوە.

ب ـ (والذي نَفْسي بيَده، لَأَنْ يَأْخُذَ أحَدُكُمْ حَبْلَه، فيَحْتَطِبَ علَى ظَهْرِه؛ خَيْرٌ له مِن أنْ يَأْتِيَ رَجُلًا، فيَسْأَلَه، أعْطاهُ أوْ مَنَعَه)[٢].

واتە: سوێندبێ بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە، ئەگەر یەکێکتان پەت و گوریسەکەی هەڵبگرێ و بچێتە چیاو، بە کۆڵێ داران بێنێ و بیانفرۆشێ، بۆی باشترە لەوەی بچێتە لای پیاوێك و داوای لێ بکات، ئەویش بیداتێ، یان نەیداتێ.

**٧ـ کارکردنی دەستەڵات و سامان بەدەستان، لەسەر ڕەواج پێدانی ئیباحییەت و ڕووخاندنی ڕەوشت و هەڵوەشاندنەوەی خێزان:**

هەرکام لەو سێ کارەش بە زەقیی هەستیان پێدەکرێ و، حیزبێکی حوکمڕان کە پێویست بە ناوهێنان ناکات و، کارەکەی زەق و زانراوە، بە پارەی بە حەڕامیی و سەرێك نراوی ئەم وڵاتە، چەندان کەناڵی ئاسمانیی و سۆشیال میدیایی کردوونەوە، کە تەنیا

---

(١) صحيح البخاري: ١٤٧٤.

(٢) صحيح البخاري: ١٤٧٠.

کاریان دڕینی پەردەی شەرم و شکۆو، بوێرکردنی خەڵکە لەسەر لادان و تاوان!

لە حاڵێکدا خوای دادگەر هەڕەشەی توندی لەو کەسانە کردوە، کە کاردەکەن بۆ بڵاوکردنەوەی باسی گوناهو تاوان و شەرم شکاندنی خەڵك:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ النور.

واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی حەزدەکەن خراپە بەنێو ئەوانەدا بڵاوبێتەوە کە بڕوایان هێناوە، ئازارێکی بە ئێشیان هەیە لە دنیاو دوارۆژداو، خوا دەزانێ و ئێوە نازانن.

بە دڵنیایش مەبەست لە (الفاحشة) لەم سیاقەدا، باسی گوناهو خراپەیە، چونکە ئەم ئایەتەو پازدە ئایەتی دیکەش (١١ ـ ٢٦) بە بۆنەی بوختانی زینا بۆکرانی دایکمان عائیشەوە، خوا لێی ڕازی بێ، دابەزیون.

هەرکەسیش بەسەرنجەوە گوێ بۆ هەندێك یان زۆربەی بەرنامەکانی ئەو کەناڵانە بگرێ، کە ئاماژەم پێدان، بە ئاشکرا بۆنی پیسی:

بڵاوکردنەوەی ئیباحییەت و، ڕەوشت نزمیی و، هەڵوەشاندنەوەی خێزان بە هۆی هەڵگێڕانەوەی ژن و مێرد لە یەکدی و، کچ و کوڕان لە باب و دایکیان و بە ئاسایی پێشاندانی لادان و تاوان، لەو بەرنامانەو کەناڵەکانیان دەکات.

**٨ ـ پشتگوێ خستنی زانست و بێبایەخ کردنی و، ڕەواج پێدانی هونەری سووکەڵە و ڕووخێنەر و، ورووژێنەر بۆ ئارەزووەکان:**

پشتگوێ خستنی زانست و بێبایەخ کردنی لە واقیعی هەرێمدا، زۆر ئاشکرایە، هەروەها ڕەواج پێدانی هونەری ڕووخێنەرو وروووژێنەریش، دیسان شتێکی ڕوون و بێ چەند و چوونە، چونکە:

أ- ئەگەر سەرنجی پێگەی زانکۆکایەکانی هەرێم بدەین لە ڕیزبەندیی ستانداردی جیهانییدا، دەبینین یەکجار لە پاشن!

ب- هەروەها لە هەموو ئاستەکانی حوکمڕانانی هەرێمەوە، خەڵات و بەرات بەخشین بە هونەرمەندانی خزمەتکاری دەستەڵات و، دەهۆڵ کوتی ستەمکارانی گەندەڵکاری پۆخڵ.

ج- هاندان یان بەلای کەمەوە بێدەنگ بوون لە بەرانبەر ئەو جۆرە کلیپ و گۆرانیی و چالاکیی بەناو هونەرییدا، وەك ڤیستیڤاڵی ڕەنگەکان و هەڵبژاردنی شاجوان و...هتد، کە مەگەر کەسێك خۆی گێل بکات: ئەگەرنا دەزانێ ئامانج لێیان ڕووخاندنی ڕەوشت و ئاسانکردنی گوناهو، بێ شەرم و شکۆکردنی خەڵکە!.

گومانیشی تێدا نیە کە هەرکام لە:

پشتگوێ خستنی زانست و بێبایەخ کردنی لە لایەك و، ڕەواج و برەو پێدانی هونەری سووکەڵەی وروووژێنەری ئارەزووەکان، کاریگەریی یەکجار خراپ و نەرێنییان لەسەر چینی گەنج و

لاو دەبێ، بۆ بەلاڕێدا بردنی و دوورخستنەوەی لە خواو ئایین و بەرنامەکەی و، بەرەو سەرگەردانیی و تلیسانەوە بردنی لە جلێتاوی گوناهو تاواندا.

**٩ ـ کارکردن بۆ خستنە گومان و دوو دڵیی گەنجان، لەبارەی خواو قورئان و پێغەمبەرەوە:**

ئەمیش یەکی دیکەیە لە گرفت و کێشەکانی گەنج و لاوەکانمان، کە بەداخەوە هەر لە لایەن ئەو دام و دەزگایانەی ڕاگەیاندنی فەرمیی نافەرمیی لایەنێکی حوکمڕانەوە "کە پێشتر ئاماژەمان پێدا" بە جیددیی کار لەسەر ئەوەش دەکرێ کە خەڵك بە گشتیی و، بە تایبەت گەنجەکان بەرانبەر بە خوا "عزوجل" و قورئان و پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" و ئیسلام، بخەنە دوو دڵیی و گومانەوە و، ئەگەر نەشتوانن ئیمانیان لێ بستێنن، بەلای کەمەوە ئیمانیان بلەقێنن!

هەڵبەتە ئەو ئامانجەش مەرج نیە هەمیشە بە ئاشکراو بێ پەردە کاری بۆ بکرێ، بەڵکو بە زۆریی میکانیزم و شێوازی ناڕاستەوخۆو لە پەناو پەردەدای بۆ دەگیرێتەبەر.

بەڵام هەموو کەسێکی هۆشیارو بێدار دەزانێ، کە ئامانجی کۆتایی زۆرێك لە بەرنامەکانی ئەو کەناڵانە، چەواشەکردنی خەڵك و خستنە گومان و دوو دڵییانە، بە تایبەتی چینی گەنج و لاو، هەربۆیەش ئەو کەسانەی بەکرێ گیراون بۆ پێشکەشکردنی ئەو بەرنامانە، کەسانی بێ ئیعتیبار یان نیشانەی پرسیار لەسەرن و،

قسەکانیشیان و شێوەی بەڕێوەبردنی بەرنامەکانیشیان، بۆنی کینەو بوغز لە دڵدا بوون، دژی ئیسلام و مسوڵمانانیان لێ دێت.

**١٠ ـ ڕێدان بە پەرەستاندنی شوێنەکانی بێناموسیی و بەکارهێنانی مادده بێهۆشکەرەکان:**

ئەمیش کاریگەرییەکی یەکجار خراپی لەسەر گەنج و لاوەکان هەیە، چونکە گەنج و لاوێکی سادەی کەم ئەزموون، لە کۆمەڵگایەکدا کە ڕێڕەو (إتجاه)ی حوکم تێیدا پشت لە خواو ئیسلام و بەها ڕووحییە بەرزەکانیەتی و، ڕوو لە خراپەو تاوان و لادانە، وەك گوتراوە: (سەرچۆپی بدە دەست گامێشێ بۆلای کادێنێی دەکێشێ).

بێگومان کاتێك دەبینێ حوکم و دەستەڵات، دەروازەکانی خراپەی بۆ ختوونە سەرپشتێ و، بەکارهێنانی شەڕاب و مەی و نێرگەلە کێشان و جۆرەکانی دیکەی خراپەکاریی بۆ ڕەوا کردوون و، لەبەرانبەریشدا هیچ قسەیەکی خێر لەو حوکم و دەستەڵاتە نابیستێ، کە ڕوو بکاتە خواو ئیسلام، مەگەر چۆن دەنا ڕوو لە خراپەکاریی و چەق و نێوەندەکانی کە دەستەڵات ڕەواجیان پێ دەدات، دەکات و، بە چەندان جۆرە گوناهو تاوان و لادانەوە گرفتار دەبێ.

ئەمانە دە (١٠) دانە بوون، لە گیرو گرفتەکانی گەنج و لاوانمان لە واقیعی ئێستای هەرێمی کوردستاندا، کە وەك پێشتر گوتمان ئەمانە بەس گرفت و کێشە سەرەکییەکانن، ئەگەرنا زیاتریشن و، لە بڕگەی داهاتووشدا، ئاماژەیەك بە چارەسەری ئەو گیرو گرفتانە دەکەین.

بڕگەی دووەم: چارەسەری ئەو گیرو گرفتانەی گەنجانی

هەرێمی کوردستان گرفتاریان بوون :

پێم وایە پێویستە لەسەر دوو ئاستان، چارەسەری ئەو گیرو گرفتانەی گەنج و لاوان بکرێن، لەسەر ئاستی قەوارەی سیاسیی و، لەسەر ئاستی خودی گەنج و لاوان، بۆیە ئەم بڕگەی دوومە لە دوو خاڵان دا دەخەینە ڕوو:

**یەکەم: لەسەر ئاستی قەوارەی سیاسیی:**

پێم وایە لەسەر ئاستی قەوارەی سیاسیی، پێویستە پێنج کار بکرێن، ئەگەر بویسترێ ئەو گیرو گرفتانەی گەنجان چارەسەر بکرێن:

**١ـ نەهێشتنی کەم و کوڕییەکانی قەوارە سیاسییەکەو، گێڕانەوەی شکۆو ئیعتیبار بۆ کۆی پێکهاتەکانی:**

پێم وا نیە هیچ کەس نکوڵیی لەوە بکات، کە ئێستا قەوارەی سیاسیی هەرێم نیشانەی پرسیاری زۆری کەوتوونەسەر:

هەم پەرلەمانەکەی و، هەم حکوومەتەکەی و، هەم دەستەڵاتە دادوەرییەکەی.

بۆیە دەبێ بە جیددیی کاربکرێ، کە بکرێتە قەوارەیەکی سیاسیی تۆکمەو ڕاستەقینە، کە خەڵك و دانیشتووان بە گشتیی و، بە تایبەت چینی تازە پێگەیشتوو و گەنج، متمانە و باوەڕیان پێی هەبێ و، بتوانێ لە هەرسێك بواری:

یاسا دانان و، جێ بەجێکردن و، دادوەرییدا، بە ئەرکی خۆی هەڵسێ و حوکمێکی ڕەشیدو سەر ڕاستانە پیادە بکات، لە ئەنجامی پیادەکردنی ئەو چوار پایەدا:

أ ـ کاری دامەزراوەیی.

ب ـ یاسا سەروەریی.

ج ـ مرۆڤبوون و هاووڵاتیی بوون بە پێوەرگرتن.

د ـ چەسپاندنی دادگەریی.

٢ـ چەسپاندنی دادگەریی و لابردنی هەموو جۆرەکانی ستەم: سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی:

وەك چۆن ستەم و زۆر، مایەی بێ پێزییە لە خێرو بێری وڵاتداو، هۆکاری سەغڵەتبوون و پشوو پێ سواربوونی خەڵك و دڵساردیی و نائومێدبوونیانە، بە پێچەوانەوە:

دادگەریی هۆکاری پیت و پێز و، مایەی ئۆقرەیی و سەقامگیریی و ئومێدەواربوونی خەڵکە.

هەر بۆیەش خوای کاربەجێ، بەڕێوەچوونی خەڵك بە دادگەریی، کردوە بە ئامانجی نێررانی تێکڕای پێغەمبەرانی "صلی الله علیه وسلم"، وەك فەرموویەتی:

﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ﴾ الحدید: ٢٥.

واتە: بە دڵنیایی پێغەمبەرانی خۆمانمان بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوە ناردوون و کتێب و تەرازووشمان لەگەڵیاندا دابەزاندوون، تاکو خەڵك بە دادگەریی هەڵسن...

گومانیشی تێدا نیە، چەسپاندنی دادگەریی، چەمك و واتایەکی زۆر فراوانی هەیە، بە تایبەت لە کاتێکدا هەرسێك بواری: حوکم و سیاسەت و ئیدارەدانی وڵات و، ئابووریی و ژیان و گوزەران و، کۆمەڵایەتیی، دەگرێتەوەو، ئەم بنەمایانەش بە بناغەی دادگەریی دادەنرێن:

١ ـ مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکدا، لەسەر بناغەی مرۆڤبوون و هاووڵاتیی بوونیان.

٢ ـ دابینکردنی پێداویستییە سەرتاییەکان، بۆیەك یەکی هاوڵاتییان.

٣ ـ یەکسانبوونی هەموولایەك، لە ماف و ئازادییەکاندا.

٤ ـ ملکەچیی هەموولایەك بۆیاساو، پێوەی پابەندبوونیان و، لەسەرەوەی یاساوە نەبوونی هیچکەسێك.

٥ ـ هەرکەسە مافی خۆی پێبدرێ و، ئەوەی لەسەریشی پێویستە لێی وەربگیرێ.

٣ ـ کارکردنی دامەزراوەیی جیددیی، بۆ گەڕانەوە بەرەو ئیمان و ئەخلاق:

ئەمیش ئەرکێکی دیکەی گەورەو گرنگی قەوارە سیاسییەکەمان و سەرجەم پێکهاتەکانیەتی.

واتە: دەبێ ڕێك پێچەوانەی ڕێڕە و(إتجاه)ی ئێستای کاربکات، کە مخابن بە زمانی حاڵ و کردار، ئەگەر بەزمانی قسەو وتاریش نەبێ، دژی ئیمان و ئەخلاق کاردەکات، یان بەلای کەمەوە گوێ پێنەدەر (مُهْمِل)و کەمتەرخەمە و، ئیمانداریی و بێ ئیمانیی و، بە ئەخلاقیی و بێ ئەخلاقیی، بەلاوە یەکسانن!

هەڵبەت ئەوەش کاتێك دەبێ، کە حوکمڕان و بڕیار بەدەستان مەبەستیان بێ و، بیانەوێ خەڵك و جەماوەر بە گشتیی و بە تایبەت گەنج و لاوان، لە خوا نزیك و خوا پەرست و ڕەوشتبەرزبن و، چیدیکە چاویان لەوە نەبێ: دامەزراوەو دام و دەزگا فەرمییەکانی، وەك وەزارەتی ئەوقاف و یەکیەتی زانایان و، نێوەندەکانی دیکە، ئامرازی دەستی وان بن و، بە هۆی دەستتێوەردانی حیزبییەوە لە نێوەڕۆکی خۆیان خاڵییان بکەنەوەو، لە هێنانەدی ئەمانجەکانی خۆیان، دووریان بخەنەوە، ئنجا یەکەمین مەرجی هەبوونی ئەو ویستن و مەبەستەش، لەلایەن حوکمڕانانەوە ئەوەیە کە کەسانێك بکرێنە بەرپرسی ئەو دامەزراوەو دام و دەزگا ڕەسمییانە، کە

پسپۆڕو شارەزای کارەکەیان و دڵسۆزیشی بن، نەك تەنیا ئەوەیان تێدا ڕچاو بکرێ، کە دڵسۆزیی حیزب بن و، شارەزای هونەری سینگ بردنە پێش و ماستا و کردن بن!

٤ـ ڕێگریی کردن لە ڕووخاندی ئیمان و دین و، تێکدانی ڕەوشت و ئاکار:

ئەمیش ئەرك و کارێکی دیکەی گرنگی قەوارەی سیاسیی هەرێمی کوردستانە، ئەگەر بویسترێ کێشەو گیرو گرفتەکانی گەنج و لاوەکانمان لە کوڕان و کچان چارەسەر بکرێن، پێشتریش لە بڕگەی یەکەمدا خستمانە ڕوو، کە بەشێك لەبەرپرس و حوکم و سامان بە دەستانی هەرێم، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، کار لەسەر پەرەپێدانی ئیباحییەت و ڕەوشت نزمیی و هەڵوەشاندنەوەی خێزان و، دژایەتییکردنی ئیمان و دین دەکەن، کەواتە:

پێویستە ئەو ڕێڕەو (إتجاه)ەش پێچەوانە بکرێتەوە، ئنجا ڕاست دەردەچێ و، لە خزمەت بەرژەوەندیی خەڵك و جەماوەر بە گشتیی و چینی گەنج و لاودا بە تایبەت دەبێ، زۆریش حەیفێ کە ئەو هەرێم و وڵاتەی ئێمە گەلێك شتی لینگەوقووچ و هەڵاوگێڕەو، پێویستە سەرەوبن بکرێ، ئنجا چاك دەبێ، بۆ نموونە:

پارە و سامانی وڵات لەجیاتی ئەوەی لە دەستی ئەمین و پاکدا بێ و، لە خزمەت زۆربەی خەڵکدا بەکاربهێنرێ، لە دەستی ناپاك دایەو، لە خزمەت کەمینەیەك لە حیزب و خزم دایەو، پێیی بوونە ملیارلێر.

٥ ـ گرنگییدان بە گەنج و لاو لە ڕووی: فێرکردن و پەروەردەکردن و کاربۆ ڕەخساندن و هاوکارییکردنەوە:

ئەرکێکی دیکەی حکومەتی هەرێم بۆ چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکنی گەنج و لاوان، ئەوەیە کە بە ئەرکی خۆی بزانێ، بە جیددیی، گرنگیی و بایەخ بەو توێژە هەستیارو کاریگەرە بدات و، لە هەموو ڕووێکەوە هەل و دەرفەتی تێگەیشتن و پێگەیشتنی بۆ بڕەخسێنێ:

لە ڕووی فێرکردن (تعليم)ەوە، کاربکرێ لەسەر دڵ و دەروونی مرۆڤ و هەست و سۆزی، چونکە وەك چۆن مرۆڤ بە هۆی عەقڵ و هۆشیەوە بەرێیی خۆی دەبینێ و، دەزانێ دەبێ چی بکات و چۆن بکات؟ بە هۆی دڵ و دەروونیشیەوە هێزو وزەی دەبێ بجووڵێ، عەقڵە کە مرۆڤ ڕێنمایی دەکات و، دڵ و دەروونیشە، کە پاڵی پێوە دەنێت و دەیجووڵێنێ.

پێویستیشە لە هەردووك بواری فێرکردن و پەروەردەکردندا ڕەچاوی هاوسەنگیی (إتزان) بکرێ و، هەر لایەنە گرنگیی و بایەخی شایستەی خۆی پێ بدرێ و، زێدەڕۆیی لە هیچ لایەکدا نەکرێ، لە سەر حیسابی لایەکی دیکە، ئەو دەقەی لە (صحيح البخاري ـ ١٩٦٨ـ )یشدا هاتوە لەو بارەوە بەرچاو ڕوونییەکی باشی تێدایە:

(إنَّ لنَفْسكَ عليكَ حقًّا، ولِرَبِّكَ عليكَ حقًّا، ولِضَيْفِكَ عليكَ حقًّا، وإنَّ لِأهلِكَ عليكَ حقًّا؛ فأَعْطِ كلَّ ذي حقٍّ حقَّهُ).

واته: به دڵنیایی مافی جەستەتت لەسەرەو، به دڵنیایی مافی پەروەردگارتت لەسەرەو، به دڵنیایی مافی میوانتت لەسەرەو، مسۆگەر مافی خێزانتت لەسەره، دەجا هەر خاوەن مافه مافی خۆی پێبده.

هەروەها له ڕووی هەل و دەرفەتی کار ڕەخساندن بۆ گەنج و لاوان و هاوکاریی کردنیشیانەوە، پێویسته حکوومەت خۆی به بەرپرسیار بزانێ لەبەرانبەر ئەو هەموو گەنج و لاوە بێکارو دەستبەتاڵانەدا، پێشم وایه ئەگەر ئەو هەموو کرێکاره بیانییانەی هەرێمی کوردستانیان پڕکردوە، بگێڕرێنەوە بۆ وڵاتەکانی خۆیان و، گەنج و لاوانی هەرێم کارەکانیان بکەن، هەلی کارێکی یەکجار زۆر دەڕەخسێت و، خەڵکێکی زۆر له بێکاریی ڕزگاری دەبێ.

شایانی باسیشه:

زۆرێك له وڵاتانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات گەڕاوم ئەو دیاردەیەی له هەرێمی کوردستان دا بۆته باو، نەمدیوە، خەڵکی ئەو وڵاتانه هەموو ئیش و کارەکانی وڵاتەکەیان، خۆیان ئەنجامیان دەدەن و، کرێکاران لەملاولاڕا ناهێنن!

ئنجا نازانم ئایا بەرپرسه لاساییکەرەوەکارنی ئێمه، باشتر له بەڕێوەبردنی وڵات دەزانن، یان هی ئەو وڵاتانه که دەوڵەتەکانیان وەك سەعات دەگێڕن؟!

**دووەم: لەسەر ئاستی خودی گەنج و لاوان:**

وێڕای ئەو پێنج ئەرکەی لە خاڵی یەکەمی ئەم بڕگەی دووەمەدا خستمانە ڕوو، کە پێویستە قەوارەی سیاسیی ئەنجامیان بدات، بۆ چارەسەرکردنی گیرو گرفتەکانی گەنج و لاوان، خودی گەنج و لاوانیش بەرپرسیارن و ئەرکیان لەسەرشانە و، نابێ تەنیا بە تەمای حکوومەت پشتێنی لێ بکەنەوەو لێی پاڵبدەنەوە، بەڵکو پێویستە هەوڵبدەن:

پشتیان بە خوا ببەستن و لەسەر پێی خۆیان بوەستن.

چونکە:

أ- گریمان حکوومەتیش هەڵوێستی خۆی ڕاست بکاتەوەو، خەمساردیی و کەمتەرخەمییەکەی خۆی بگۆڕێ بۆ بە ئەرکی خۆ هەڵسان و، مشوورخۆریی و دڵسۆزیی نواندن بۆ هەموو لایەك، بە تایبەت و گەنج و لاوان و، چارەسەرکردنی گیرو گرفتەکانیان "کە من ئەوە بە دوور دەزانم بە لەبەر چاوگرتنی ئەو عەقڵییەت و سرووشتەی، ئێستا جڵەوی حوکمڕانیی بە دەستەوەیە" دیسان ئەوە نابێتە جێگرەوە (بدیل)ی هەوڵ و هیممەتی گەنج و لاوان خۆیان و، بەڵکو خۆشیان هەردەبێ هەوڵبدەن و کاربکەن و، بە دیار چاوەڕوانیی هیچ کەس و لایەنێکەوە، دەستە و ئەژنۆ دانەنیشن، بەڵکو لەوان هەوڵ و هیممەت و حەرەکەت و، لە خوای بەخشەریش

ڕێنمایی و بەرەکەت، گوتراویشە: (ما حَكَّ ظَهْرَكَ مِثْلُ ظُفْرِكَ)، هیچ شتێك وەك نینۆکی خۆت پشتتی نەخوراندوە.

ب- ئەگەر حکوومەتیش لەسەر حاڵ و هەڵوێستی ئێستای خۆی بەردەوامبێ و، لەسەر بێ هەستیی و بێ هەڵوێستیی خۆی بەرانبەر بە کۆمەڵگا بەگشتیی و گەنج و لاوان بە تایبەت سووربێ، بێگومان بێ هەستیی و بێ هەڵوێستیی حکوومەت و کەمتەر خەمییەکەی لەملی خۆیدایەو، نابێتە بیانوو و پاساوی هەڵخزان و پاڵدانەوەی گەنجان و، نەخستنە گەڕی هەوڵ و هیممەتیان، چونکە بێگومان هەموو مرۆڤێك لە خودی خۆیدا ئەرکدارو بەرپرسیار (مُكَلَّف و مسئول)ە، وەك خوای کاربەجێ بە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ـ صلى الله عليه وسلم ـ ی فەرموە:

﴿ فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ النساء: ٨٤

واتە: لە ڕێی خوادا بجەنگە، تەنیا خۆت ئەرکدار کراوی و، بڕوادارانیش هان بدە...

ئەوەی پێویستیشە گەنج و لاوان بە کۆو، هەرکامیشیان لە خودی خۆیدا بە تەنیا پێی هەڵسن، ژمارەیەك ئەرك و کارن، کە ئەمانە گرنگترینیانن:

١ـ خۆ گۆڕین و چاو بە خۆدا گێڕانەوە، لە ڕووی بوونناسیی و تێڕوانینەوە:

ئەو یەکەمین و گرنگترین ئەرکی هەرکەسێکە "گەنج و جگە لە گەنج" کە دەیەوێ واقیعەکەی خۆی لە ڕووی سیایی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەوە بگۆڕێ، چونکە هەمیشە واقیع و حاڵی هەر کۆمەڵگایەك، ڕەنگدانەوەی خودی تاکەکانیەتی لە جۆری بیرو خولیاو، هەست و نەست و، ئاکارو ڕەوشتەکانیان، خوای پەنهانزانیش فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ ﴾ الرعد: ١١.

واتە: بە دڵنیایی خوا حاڵ و واقیعی هیچ کۆمەڵێك ناگۆڕێ، تاکو ئەوان ئەوەی لە خودەکانیان دایە نەیگۆڕن...

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە، بوونناسیی و تیڕوانینی هەرکەسێك بناغەی کەسایەتییەتی، واتە: ئەوە کە: چۆن خۆی و، بوون و، گەردوون و، ژیان و، دەوروبەرو، دنیاو دوا ڕۆژو...هتد دەبینێ؟

کە لەم ڕۆژگارەشماندا بوونناسیی ماددییگەرایی و دژی ئیسلامیی لە نێو مسوڵمانناندا، زۆر باوەو، هەژموونی بەسەر خەڵکێکی زۆر لە مسوڵمانناندا پەیدا کردوە، بۆیە پێویستە:

گەڕانەوە بۆ بوونناسیی ئیسلامیی، کە لە تەوەری دووەمدا لە حەوت بڕگەدا تاڕادەیەك تیشکمان خستە سەری و، لێرە دووبارەی ناکەینەوەو، ئەوەندە دەڵێین: کە لەم ڕۆژگارەدا خەڵکێکی زۆر لە

مسوڵمانان بەتایبەت گەنج و لاوەکانیان، کەم و زۆر کەوتوونەتە ژێر هەژموون و کاریگەریی ڕەوت (إتجاه) ی ماددەگەریی بە جەستەی ڕووت دانانی مرۆڤ و، تەنیا بە دیوە ماددییەکەی دانانی ژیان و، ئەوەش لە هەموو کایەکانی ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییاندا، ڕەنگی داوەتەوەوە زۆرێك لە گرفت و کێشەکانی گەنج و لاوەکانیش، ڕەگ و ڕیشەیان پەیوەستە بەو گۆڕانکارییە نەرێنییەیانەوە.

بۆیەش پێم وایە:

هەنگاوی یەکەمی خۆ گۆڕین و، چاو بە خۆدا گێڕانەوەی گەنج و لاوەکانمان، پێویستە لێرەوەبێ و، گەنج و لاوەکانمان بوێرانە لە لاساییکردنەوەی کوێرانەی ڕێڕەوی ماددیگەرایی هەڵگەڕێنەوەو، خواناسیی و ئیمانی خۆیان، هێندە بەهێزو پتەو بکەن، کە نەکەونە ژێر کاریگەریی و هەژموونی ڕەوتی ماددیگەرایی بە ئاژەڵ دانەری مرۆڤ و تەنیا دیوە ماددییە بینەرەکەی ژیان و، بە شێوەیەکی قووڵی زانستییانە بوونناسیی (علم الوجود ـ Ontology)ی ئیسلامیی تەبەننیی بکەن، کە تاکە جۆری بوونناسیی ڕاست و دروستە، لەم ڕۆژگارەدا لەبەردەستی مرۆڤایەتییدا هەبێ.

٢ـ خۆتێگەیاندن و پێگەیاندنێکی هاوسەنگ:

دوای تەبەننیی کردنی بوونناسییەکی ڕاست و دورست، پێویستە گەنج و لاوەکانمان بە کۆمەڵ و تاك تاکیشیان، هەوڵی جیددیی

بدەن بۆ خۆتێگەیاندن و پێگەیاندنێکی هاوسەنگ، سوپاسیش بۆ خوای بەخشەری میهرەبان، ئێمە لە مەوسووعەی: (بەرەو تێگەیشتن و پێگەیشتن)دا، کە لە دوازدە کتێب پێکهاتووەو، لە هەر کام لەو دوازدە کتێبەدا بابەتێکی گرنگ توێژاوەتەوەو، پێم وایە ئەو مەوسووعە دوازدە کتێبی یان ئەو زنجیرە دوازدە ئاڵقەییە، بەرنامەو نەخشەڕێیەکی تێروتەسەلە بۆ پێگەیاندن و پێگەیاندنی مسوڵمانان لەم ڕۆژگارەدا، بە تایبەت چینی گەنج و لاو لە کوڕان و کچان.

مەبەستیشمان لە تێگەیشتن و پێگەیشتنی هاوسەنگ، ئەوەیە کە تێکڕای پێکهاتەکانی مرۆڤ: عەقڵ و هۆش، دڵ و دەروونی، هەست و سۆزی، جەستەی و، لایەنەکانی:

تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی، بگرێتەوەو، تێکڕای بوارەکانی: بوونناسیی، ئیمان و عەقیدە، خواپەرستیی، تەقواو تەزکییە، ڕەوشت و ئاکار، بانگەواز، فەرمان بە پەسەندو ڕێگریی لە ناپەسەند، پاکسازیی و چاکسازیی کردن، کاری سیاسیی، یەکخستنی مسوڵمانان بگرێـتەوە.

هەموو ئەوانەش لە مەوسووعەی ناوبراودا، هەن.

٣ ـ بیرکردنەوە لە گۆڕینیی واقیع، نەك بە جێهێشتنی و لەبەر ڕاکردنی:

ئەرکێکی دیکەی گەنج و لاوەکانمان لەم هەل و مەرجەدا، ئەوەیە کە لە جیاتی ئەوەی "وەك لە ماوەی ڕابردووداو ئێستاش ژمارەیەکی زۆریان کردیان" بیر لە بەجێهێشتنی واقیع و کۆمەڵگایەکەیان

بکەنەوەو لێی ڕابکەن، بیر لە گۆڕینی و پاکسازیی و چاکسازیی تێدا کردنی بکەنەوە، وەك سیفەتێکی گەورەو بنەڕەتیی بڕوادارانی ڕاستەقینە، کە خوای تاك و پاك، لە وەسف و پێناسەیاندا فەرموویەتی:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ ﴾ التوبة.

کە پێشتریش ئەم ئایەتەمان هێنایەوەو ماناشمان کردوە.

هیچ گومانیشی تێدا نیە، گۆڕانکاریی بە کەسانی بە هێزو خۆڕاگر نەبێ ناکرێ و، گەیشتن بە تاراوگەو ژیان بردنە سەریش لەوێ، ئاسان نیەو وڵاتی خۆمان پڕە لە خێرو بێرو، حەیف بۆ کەمینەیەکی مشەخۆرو گەندەڵ و خۆسەپێنی بەجێ بهێڵین و، با لەجیاتی ئەوە قۆڵی هیممەتی لێ هەڵبکەین و پاکسازیی و چاکسازیی تێدا بکەین و، وای لێبکەین بۆ هەموو لایەك بەکەڵکی تێدا ژیان بێت و، چی دیکە خێرو بێرەکەی لە دەست کەمینەیەك لە حیزب و خزمی گەندەڵ و قۆرخکاردا قەتیس نەبێ و، خەڵکێکی زۆریش کە ئامادەیی کۆیلایەتیی و زەبوونیی نواندن نیە، لێی بێبەش بێ!

پێغەمبەری خواش لەبارەی تێکەڵیی لەگەڵ خەڵکداو، خۆڕاگریی لەسەر ئازارو ناڕەحەتییەکان فەرموویەتی:

(المؤمنُ الذي يُخالطُ الناس و يَصبرُ على أذاهُمْ، أفضلُ من المؤمنِ الَّذي لا يُخالِطُ النَّاسَ و لا يَصَبرُ على أذاهُمْ)[1].

واتە: ئەو بڕوادارەی تێکەڵیی خەڵك دەکات و، لەسەر ئازارو نارەحەتییان خۆی ڕادەگرێ، چاکترە لەو بڕوادارەی تێکەڵیی خەڵك ناکات و، خۆشی لەسەر ئازاریان ڕاناگرێ.

هەڵبەت بەبێ پشوو درێژیی و خۆڕاگریی لەسەر ئازارو نارەحەتیی هەرگیز گۆڕانکاریی ناکرێ، بۆیەش پێغەمبەران "علیهم الصلاة والسلام" بە کۆمەڵگا بێبڕوایەکانی خۆیانیان فەرمووە:

﴿ وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ إبراهيم.

واتە: هەرچەندە ئازاریشمان بدەن، هەر خۆڕاگر دەبین و با بڕوادارانیش تەنیا پشت بە خوا ببەستن.

هەروەها (لوقمان)یش لە ئامۆژگاریی کردنی کوڕەکەیدا دەڵێ:
﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾ ﴾ لقمان.

واتە: ئەی کوڕە خۆشەویستەکەم! نوێژ بەرپا بکەو، فەرمان بە پەسەند بکەو، ڕێگریی لە ناپەسەند بکەو، لەسەر ئەوەی تووشیش دەبێ خۆت ڕابگرە، بێگومان ئەوە، لە کارە جەخت لەسەرکراوەکانە.

---

(١) ابن ماجه: (٤٠٣٢)، وأحمد: (٥٠٢٢)، باختلاف يسير، والطبراني في ((المعجم الأوسط)): (٥٩٥٣)، والبيهقي: (٢٠٦٦٩) واللفظ لهما.

بەدڵنیاییش کەسانێك کەلەواقیعێك ڕادەکەن، گریمان کارەکەشیان سەرەو خێربێ و ئامانجیش بپێکین، ئەو پەڕەکەی خۆیانیان قوتارو دەرباز کردوە، بەڵام کەسانێك کاربکەن بۆ گۆڕانکاریی کردن لە کۆمەڵگاداو پاکسازیی تێداکردنی، وێڕای خۆیان خەمیان لە خەڵکیش خواردوە، بگرە وێڕای ئێستای کۆمەڵگاو خەڵکەکەیان، مشووری ئایندەشیانیان خواردوە!

٤ ـ وریابوون لە سۆشیال میدیاو لە هاوەڵی خراپ:

ئەرکێکی دیکەی گەنج و لاوان، کە دەبێ خۆیان پێی هەڵسن ئەوەیە کە:

یەك: لە مامەڵە کردنیان لەگەڵ سۆشیا میدیا (ڕاگەیاندنی کۆمەڵایەتیی) زۆر وریاو هۆشیار بن، سۆشیال میدیا بە هەموو جۆرەکانیەوە:

فەیسبووك - facebook
تویتەر - Twiter
ئینیستاگرام - Instagram
سناپ چات - Snapchat
واتس ئاپ - WhatsApp
ڤایبەر - Viber

چونکە ڕاگەیاندن و کەناڵ و شێوازو ئامرازەکانی بە گشتیی و، بە تایبەت سۆشیال میدیا، وەك تیغێکی دوو دەم (سلاح ذو حدَّين)

وایەو، بە هەردووك دیواندا، دیوی چاکەو خراپە (خیر و شر) دەبڕێ و، دەگونجێ بۆ هێنانەدی ئامانجی چاك یان خراپ بەکاربهێنرێ و، کاریگەرییەکەیشی زۆر خێرایە، یەکجاریش بەربڵاوەو، یەکسەر بە هەموو دنیادا بڵاو دەبێتەوەو، هەر دوای تاو (لحظة) یێك خاوەنەکەی بۆی کۆناکرێتەوە!

هەموو لایەکیش ئاگادارن، کە کێشەو گیروگرفتی زۆرو جۆراو جۆر بە هۆی خراپ بەکارهێنانی سۆشیال میدیاوە، لە نێو کۆمەڵگادا بە تایبەت چینی گەنج و لاو، سەریان هەڵداوەو، هەندێکیان سەریان کێشاوە بۆ شەڕو کوشتارو کوژران و، لێك هەڵوەشانەوەی خێزانەکان و...هتد، بۆیە پێویستە دەرس و عیبرەت لە هەموو ئەو دەرهاویشتە بەدو خراپانەی خراپ بەکارهێنانی سۆشیال میدیا وەربگیرێ.

دوو: هەروەها دەبێ گەنجەکانمان لە بواری هاوەڵایەتییش (مصاحبة) دا، دووربین و هۆشیار بن و بەبێ شارەزایی و ئەزموونکردن (تجریب) لە هاوەڵایەتیی و دۆستایەتیی گرتندا، پەلەنەکەن، چونکە پێشینان گوتوویانە:

(پارە دینە دەرو دینەبەرە) منیش دەڵێم:

(برادەرو هاوەڵ دیندەرو دینبەرە)، زۆر کەس بووە مرۆڤێکی ڕاست و ڕێك بووە، بەڵام لە ئەنجامی لێ نیزیککەوتنەوەو هاوەڵایەتیی کەسێکی خراپ و لاردا، ڕاستیی و ڕێکییەکەی گۆڕاوە بۆ لاریی و نالەباریی.

خوای بەرزو مەزنیش لەو بارەوە فەرموویەتی:

﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِى ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِى لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدْ أَضَلَّنِى عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِى ۗ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِلْإِنسَٰنِ خَذُولًا ﴿٢٩﴾ ﴾ الفرقان.

واتە: ئەو ڕۆژەش (ڕۆژێکی ترسناکە) کە ستەمکار هەردووک دەستی دەگەزێ (لە پەشێمانییان) دەڵێ: ئای خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێم گرتبایەبەر، ئای هاوار بۆ من! خۆزگە فڵانەکەسم بە دۆست نەگرتبایە، بە دڵنیایی لە یادی خوا (قورئان) لایدام، دوای ئەوەی بۆم هات و شەیتانیش بۆ مرۆڤ زۆر (فریودەرو) پشت بەردەرە.

هەروەها پێغەمبەری خواش "صلى الله عليه وسلم" لە بارەی هەستیاریی و گرنگیی هاوەڵایەتییەوە فەرمایشتی زۆرن، بۆ نموونە:

١ ـ (الرجلُ على دينِ خليله فلينظرْ أحدُكم من يُخالِلُ)[١].

واتە: مرۆڤ لەسەر ئایینی دۆست و خۆشەویستەکەیەتی، ئنجا با یەکێکتان باش ڕامێنێ، دۆستایەتیی کێ دەکات!).

٢ـ (مَثَلُ الجَليس الصَّالح والجَليس السَّوْء، كَحَامل الْمسْك وَنَافخ الْكير، فَحَاملُ الْمسْك: إمَّا أَنْ يُحْذيَكَ، وَإمَّا أَنْ تَبْتَاعَ منْهُ، وَإمَّا أَنْ تجدَ منْهُ ريحًا طَيِّبَةً، وَنَافخُ الْكير: إمَّا أَنْ يُحْرقَ ثيَابَكَ، وَإمَّا أَنْ تجدَ ريحًا خَبيثَةً)[٢].

---

(١) أبو داود: (٤٨٣٣)، والترمذي: (٢٣٧٨)، وأحمد: (٨٣٩٨).
(٢) البخاري: ٥٥٣٤.

واتە: وێنەی هاونشینی چاك و هاونشینی خراپ، وەك هەڵگری میسك (عەتر فرۆش)و، فووکەر لە مووشەدەمە (ئاسنگەر) وان، هەڵگری میسکیان دەتداتێ، یان لێی دەکڕی، یان بۆنێکی خۆشی لێ دەکەی، کوورەچییش، یان پۆشاکت (بە پڕیشکە ئاگران) دەسووتێنێ، یان بۆنێکی ناخۆشی لێ دەکەی (یان دەنگی جاڕزکەری لێ دەبیستی).

بەڵێ هەمیشە برادەرایەتیی و هاوەڵایەتیی، هەستیاریی و گرنگیی خۆی هەبووەو، کاریگەریی چاك، یان خراپی لەسەر مرۆڤ داناوە، بەڵام بەتایبەت لەم ڕۆژگارەدا، کە لە سایەی ژیانی ماددییگەرایی سەپێنراودا، لە لایەن سیکۆلاریزم و لیبڕاڵیزم و گلۆباڵیزەیشنەوە، مرۆڤەکان تا ڕاددەیەکی زۆر بەرەو تاکگەرایی و گۆشەگیریی (الإنفراد والعزلة) چوون و، گەلێك جاران یەکێك خۆزگە بە هەبوونی دۆست و هاوەڵێك دەخوازێ!

٥ـ خۆ بەهێزکردن لە ڕووی فیکریی و زانستیی و، ئیمانیی و ڕووحیی و ڕەوشتییەوە:

ئەرکێکی دیکەی گەنج و لاوەکانمان کە پێویستە لە خودی خۆیان دا پێی هەڵسن، ئەوەیە کە بۆ ئەوەی لەبەرانبەر کارتێکەرە خراپەکان (المؤثِّرات السلبيَّة)دا توانای بەرگریی و خۆپارێزییان هەبێ، لە ڕووی:

فیكریی و زانستیی و، ئیمانیی و، ڕووحیی و ڕەوشتییەوە، خۆیان بەهێز بكەن و، تۆكمەو دامەزراو و نەلەخشاوبن.

١- بە دڵنیاییش ڕێی بەهێزبوون، لە ڕووی فیكریی و زانستییەوە، بریتیە لە هەرچی پتر بەكارهێنانی عەقڵ و هۆش و پێنج هەستەكان، لە بیركردنەوەو لێكۆڵینەوەو ڕامان و سەرنجدان و، گوێگرتن و پەیداكردنی زانیاریی و شارەزایی قووڵترو زیاتر، لە هەموو ئەو شتانەدا، كە پێویستە پێیان ئاشناو تێیاندا بەرچاو ڕوون و شارەزابێ، ئەوە وەك فیكرو زانست بە گشتیی، بۆ زیاتر تێگەیشتن و زانیاربوونیش بە تایبەت لەبارەی ئیسلامەوە، ڕێیەكەی بریتیە لە هەوڵدان بۆ خوێندنەوەو تێوە ڕامان و لێوردبوونەوەی قورئان و ڕێبازی پێغەمبەری خوا موحەممەد "صلی الله علیه وسلم" چونكە ئیسلام لە قورئان و سوننەتدا كورت هەڵاتوەو، جگە لەوان هەمووی تێگەیشتن (فهم)ە لەبارەیانەوەو، جگە لە وەحیی خوا، هیچ شتێكی وەك ئایین پابەندكەر (مُلْزِم) نیە بۆ مسوڵمان و، تەنیا ڕێنمایی و هاوكارو یارمەتییدەرە بۆ لێتێگەیشتنی وەحیی بەرجەستە لە قورئان و سوننەتدا.

٢- ڕێی بەهێزكردنی ئیمانیش لە كۆمەڵێك شتدا بەرجەستە دەبێ، وەك:

زیادبوونی زانیاریی و شارەزایی بە ڕەهایی و، بە تایبەت لەبارەی كتێبی خواو ڕێبازی پێغەمبەری پێشەواوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ۝٦ ﴾ سبأ.

واتە: ئەوانەی زانیارییان پێدراوە، دەبینن (دەزانن) کە ئەوەی بۆ لای تۆ دابەزێنراوە بەس ئەوە هەقە و، بەرەو ڕاستەڕێی (خوای) زاڵی ستایشکراو ڕێنمایی (خەڵك) دەکات.

هەروەها فەرمانبەریی و چاکەکاریی (إطاعة و إحسان)ی زیاترو باشتریش، یەکی دیکەیە لە هۆکارەکانی بەهێز بوونی ئیمان، زانایان لەوبارەوە وەك بنەمایەك گوتوویانە:

(الإيمان يزيد بالطاعة وينقص بالمعصية)، ئیمان بە فەرمانبەریی زیاد دەکات و، بەسەرپێچیی کەم دەکات.

خوای تاك و پاکیش فەرموویەتی:

﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ۝١٧ ﴾ محمد.

واتە: ئەوانەش کە ڕێی ڕاستیان گرتوە (خوا) سەرڕاستیی بۆ زیادکردوون و، پارێزکاریی پێداون.

٣- بەهێزبوونی لایەنی ڕووحیی و مەعنەوییش، بەرهەمی زیادبوونی زانست و بەهێزبوونی ئیمان و قووڵبوونەوەی تەزکیەو پارێزکارییە، وەك خوای زاناو توانا فەرموویەتی:

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ۝٢٨ ﴾ الرعد.

واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو دڵیان بە یادی خوا ئارام دەگرێ، ئاگاداربن! دڵان بە یادی خوا ئارام دەگرن.

٤- هەروەها بەهێزبوونی ڕەوشت و ئاكاریش بەرهەمی بەهێزبوونی ئیمان و لایەنی ڕووحیی و مەعنەوییەو، مرۆڤ هەتا ئیمانی مەحكەمترو، تەزكیە و پارێزكاریی و لایەنی مەعنەویی بەهێزتربێ، ڕەوشت و ئاكاری چاكترو دامەزاروتر دەبێ و ئەو لایەنانە هەموویان پێكەوە پەیوەستن و، وەك ئاڵقەكانی زنجیرێك یەكدی دەبەستنەوەو، ئەم دوو ئایەتەی سووڕەتی ئیبڕاهیمیش بە باشترین شێوە، ئەو چەمك و مەبەستە دەگەیەنن:

﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾﴾ إبراهيم.

واتە: ئایا نابینی چۆن خوا وێنەیەكی هێناوەتەوە: وشەیەكی پاك و چاك وەك درەختێكی پاك و چاك (بەردار)ە، بنكەكەی (لە زەویدا) چەسپاوەو لقەكانی بەرز بوونەوە، بە مۆڵەتی خاوەنەكەی هەموو كاتێك میوەكەی دەدات، ئاوا خوا وێنان بۆ خەڵك دێنێتەوە، بەڵكو پەند وەربگرن.

وەك دەبینن:

لەم دوو ئایەتە بە پێزەدا، خوای زاناو شارەزا، وێنەی بۆ وشەیەكی پاك و چاك "كە زۆربەی هەرە زۆری ڕوونكەرەوانی

قورئان گوتوویانە مەبەست پێی وشەی خوا بەیەکگرتن (کلمة التوحید ـ لا إله إلا الله)ە" بە درەختێکی بەردارو پاك و چاك هێناوەتەوە، کە لە سێ بەشان پێکهاتوە:

أ- بنك (أصل).

ب- لق و پۆپ (فرع).

ج- بەر و میوە (أُكُل).

ئنجا بنکەکەی دەکەوێتە بەرانبەر ئیمان و عەقیدە و، لق و پۆپەکەشی لە بەرانبەر فەرمانبەریی (طاعة) دایەو، بەرو میوەکەش لە بەرانبەر ڕەوشت و ئاکاردایە، ئنجا وەك چۆن هەتا درەخت ڕەگ و ڕیشەو بنکەکەی دامەزرا ترو، لق و پۆپەکانی بەرز هەڵچووتر بن، بەرو میوەکەشی باشتر دەبێ، دینداریی و خواپەرستییش، هەتا ئیمانەکەی قایمترو ڕۆچووتر بێ و، فەرمانبەریی و پابەندییەکەی باشتر بێ، ڕەوشت و ئاکارێکیش کە لێیان بەرهەم دێ، جوانترو بەردەوامتر دەبێ.

هەڵبەتە بە ئەندازەی ئەوە کە گەنج و لاوەکانمان، فیکرو زانستی خۆیان زیاتر گەشە پێدەدەن و، ئیمانی خۆیان بەهێزترو مەحکەمتر دەکەن و، خوا پەرستیی و فەرمانبەریی خۆیان ساغ و بەپێزتر دەکەن و، لایەنی ڕووحیی و مەعنەویی لە خۆیاندا باشتر دەکەن و، ڕەوشت ئاکاری خۆیان بەرزترو جوانتر دەکەن، هێزو وزەی

زیاترو باشتر دەستەبەر دەکەن، بۆ ڕوو بە ڕوو بوونەوەی کێشەو گیروگرفتەکانیان و، چارەسەرکردنیان و، بەسەردا زاڵبوونیان، نەك لەبەرانبەریاندا، تێشکان و بەزین و چۆکدادان!



## لە کۆتاییدا

گەنج و لاوە خۆشەویستەکان!

لە کۆتایی ئەم بابەتەدا "کە ویستم تێیدا باسی هەستی ڕێك و ڕاست و، هەڵوێستی پێویست و پڕ بە پێستی، گەنج و لاوانێك بکەم"، کە دەیانەوێ پارێزگاریی لە ڕەسەنایەتیی مسوڵمانتیی خۆیان بکەن و، پێناسەی:

(گەنج و لاوی مسوڵمان) بیانگرێتەوەو شایستەیان بێ، بە پەسەندی دەزانم پێنج ئامۆژگاریی و پەند ئاسای گرنگتان پێشکەش بکەم:

١ـ سیستم و ڕێك و پێکیی، بناغەی گەردوون بە گشتیی و، تاك تاکی دروستکراوەکانە و، بەبێ نەخشەو بەرنامەدانان و ڕێکخستنی کات و کار، گەشە ناکەین.

٢ـ باوەڕو متمانە بەخۆبوون، لقێکی بڕوا بە خوا بوونە، چونکە ئێمەش هەر لەلایەن ویەوەین.

٣ـ بە ئەندازەی هۆشیاریی عەقڵمان، بە هۆی بیرکردنەوەو زانستەوەو، بێداریی دڵمان، بە هۆی تەقواو تەزکیەوە، ڕێی تێرو تەواویی دەبڕین و صاڵح دەبین و بەرەو خوا دەچین.

٤ـ هەركەس بترسێ هەڵە نەكات، دەبێ هیچ قسەیەك نەڵێ و، هیچ كارێك نەكات.

٥ـ گرفت و كێشەكان و ناهەمواریی و ناسۆرەكان دەمانگەیەنن، وەك چۆن ئاگر خواردن و خواردنەوە دەكوڵێنێ و، گەرما میوەو دانەوێڵە دەگەیەنێ.



# کۆی بەرهەمە چاپکراوەکان

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| | أ / کتێبە کوردییەکان | | |
| | قورئان و سوننەت | | |
| ١ | پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤ چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| ٢ | با لە خزمەت قورئاندا بین، [کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟)و (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە] | چاپی یەك/٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| ٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١) سوورەتەکانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٢) سوورەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٣) سوورەتی: (النساء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٦ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٤) سوورەتی: (المائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٥) سوورەتی: (الأنعام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٦) سوورەتی: (الأعراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٩ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٧) سوورەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ١٠ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٨) سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| ١١ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٩) سوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٢ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٠) سوورەتی: (هود) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٣ | تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز، بەرگی: (١١) سوورەتی: (يوسف) | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| ١٤ | تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز، بەرگی: (١٢) سوورەتەكانی: (الرعد، إبراهيم، الحجر) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٥ | تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز، بەرگی: (١٣) سوورەتی: (النحل) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٦ | تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز، بەرگی: (١٤) سوورەتی: (الإسراء) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٧ | تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز، بەرگی: (١٥) سوورەتەكانی: (الكهف) و (مريم) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٨ | تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز، بەرگی: (١٦) سوورەتەكانی: (طه) و (الأنبياء) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٩ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٧) سوورەتەکانی: (الحج) و (المؤمنون) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٢٠ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٨) سوورەتەکانی: (النور) و (الفرقان) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٢١ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٩) سوورەتەکانی: (الشعراء) و (النمل) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٢٢ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٢٠) سوورەتەکانی: (القصص) و (العنكبوت) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٢٣ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٢١) سوورەتەکانی: (الروم) و (لقمان)و (السجدة) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٢٤ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٢٢) سوورەتەکانی: (الاحزاب) و (سبأ) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٢٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٢٣) سوورەتەکانی: (فاطر) و (یس)و (الصّافات) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٢٦ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٢٤) سوورەتەکانی: (ص) و (الزمر)و (غافر) | چاپی یەك/٢٠٢٢ | |
| ٢٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٢٥) سوورەتەکانی: (فصلت) و (الشورى)و (الزخرف) | چاپی یەك/٢٠٢٢ | |
| ٢٨ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٢٦) سوورەتەکانی: (الدخان) و (الجاثية)و (الأحقاف) و (محمد) | چاپی یەك/٢٠٢٢ | |
| ٢٩ | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسەو گرنگیی‌و پێویستیی | چاپی یەك/٢٠١٦ چاپی دوو/٢٠١٨ | |
| ٣٠ | قورئانی مەزن لە نۆزدە تەوەرەدا | چاپی یەك/٢٠٢١ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | بیروبڕواو فیکری ئیسلامیی | | |
| ٣١ | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام‌و ڕێچکان | چاپی یەك/١٩٨٥ چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| ٣٢ | ڕێبازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کامەیە ؟! | چاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو کتێبی (مسوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروباوەڕی مسوڵمان) |
| ٣٣ | پڕۆژەی بەرنامەی پەروەردەو فێرکردنی ئیسلامییانە | چاپی یەك/١٩٩٥ | دواتر خرایە نێو کتێبی: (پڕۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی) |
| ٣٤ | پڕۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ٣٥ | بنەما شەرعییەکان‌و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١ چاپی چوار/٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |
| ٣٦ | چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم، سەرنجێکی واقیعیانەو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢ چاپی شەش/٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی‌و تورکیی‌و فارسییش |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٣٧ | خواناسیی، ئایین، ئیمان (درەوشاوەیی ئیسلامو پووچەڵیی ئیلحاد) | چاپی یەك/٢٠٠٢ چاپی سێ/٢٠٢٠ | |
| ٣٨ | ناوە هەرەجوانەکانی خوا «سبحانە وتعالی» | چاپی یەك ٢٠١٣/ | |
| | مەوسووعەی : ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، (٦ بەرگ) | | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ |
| ٣٩ | بەرگی یەکەم: ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |
| ٤٠ | بەرگی دووەم: خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا | | |
| ٤١ | بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناو و سیفەتو لەپەرستراوێتییدا | | |
| ٤٢ | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٤٣ | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دوایی‌و قەزاو قەدەر | | |
| ٤٤ | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی‌و دیدوبۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | | |
| ٤٥ | مسولمانی کامڵ : بەشی یەکەم : بیروباوەڕی مسولمان | چاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا) |
| ٤٦ | تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی‌و خاڵە هاوبەش‌و جیاوازەکانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨ چاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (هاووڵاتیی)و، ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ٤٧ | ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان‌و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢ چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٤٨ | تەرجەمەی کوردیی عەقیدەی طـه حاویی | چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ٤٩ | ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طه حـاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٥٠ | سیکۆلاریزمو دیموکراسیی لەئەزموونی کوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبیو، شێوەزاری کرمانجیی |
| ٥١ | درەوشاوەیی ئیمانو پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر ڕۆشنایی زگماكو عەقڵو زانستو وەحییدا | چاپی یەك/٢٠١٩ چاپی دوو/٢٠٢٠ | |
| ٥٢ | مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحییو واقیعدا | | |
| ٥٣ | کتێبی یەکەم: پێناسەو چییەتو سەر گوزشتەو سەرچاوەکانو گرنگیی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ٥٤ | کتێبی دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ٥٥ | کتێبی سێیەم: تەوژمە سەرەکییەکانی مێژووی مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ٥٦ | کتێبی چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٩ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ٥٧ | کتێبی پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| | زنجیرەی: باچاکتر ئیسلام بناسین! | | ئەم سێ ئاڵقەیە: دوایی خرانە نێو مەوسووعەی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە |
| ٥٨ | ئاڵقەی یەکەم: سەلماندنی بوونی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٥٩ | ئاڵقەی دووەم: پێغەمبەران «علیهم الصلاة والسلام» | چاپی یەك/١٩٨٩ چاپی دوو/١٩٩٠ | |
| ٦٠ | ئاڵقەی سێیەم: ڕۆژی دوایی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٦١ | ئاڵقەی چوارەم: ئایین | | دوایی خرایە نێو کتێبی: (خواناسیی، ئایین، ئیمان) |
| ٦٢ | بیرو باوەڕ | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٦٣ | زنجیرەی: بەرەو باشتر تێگەیشتنو پێگەیشتن، کە لە: (١٢) کتێب پێکهاتوە | | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٦٤ | بەرگی یەکەم: واقیعی دژواری ئۆممەت: هۆکارو چارەسەر | چاپی یەك/٢٠٢٠ چاپی دوو/٢٠٢١ | |
| ٦٥ | بەرگی دووەم: هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٩ چاپی دوو/٢٠٢١ | |
| ٦٦ | بەرگی سێیەم: چۆنیەتی گۆڕینی کۆمەڵگاو پاکسازیی‌و چاکسازیی تێداکردنی | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٦٧ | بەرگی چوارەم: بەرەو بانگەوازێکی ڕاست‌و ڕەسەن | چاپی یەك/٢٠١٩ چاپی دوو/٢٠٢١ | |
| ٦٨ | بەرگی پێنجەم: پایەکانی بووناسیی‌و، ڕوونکردنەوەی ئیمان | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٦٩ | بەرگی شەشەم: خواپەرستیی، تەزکیە، تەقوا | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٧٠ | بەرگی حەوتەم: بنەما گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠٢١ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٧١ | بەرگی هەشتەم: تایبەتمەندییە ئیمانییو فیکرییەکانی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٧٢ | بەرگی نۆیەم: ڕەوشتبەرزیی دروشمی سەرەکیی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٧٣ | بەرگی دەیەم: چوار بابەتی سیاسیی گرنگو هەستیار | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٧٤ | بەرگی یازدەیەم: بنچینە گرنگەکانی تەباییو یەکریزیی مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٧٥ | بەرگی دوازدەیەم: بنەڕەتەکانی مسوڵمانەتییەکی ڕاستو هاوسەنگ | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| | فیقهـی ئیسـلامیی | | |
| | مەوسـووعەی: خواپەرسـتیی ئیسـلامیی (٤ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٠ چاپی دوو/٢٠٠٩ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چـاپ | تێـبـیـنـی |
|---|---|---|---|
| ٧٦ | بەرگی یەکەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەکان، پاكو خاوێنیی | | |
| ٧٧ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاکردن یەکەمین درووشمی خواپەرستیی | | |
| ٧٨ | بەرگی سێیەم: زەکاتو ماڵ بەخشین | | |
| ٧٩ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەجو عومرەکردن، زیکری خواکردن | | |
| ٨٠ | بنچینە گرنگەکانی هەڵسوکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا | چـاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێـڕراوە |
| ٨١ | جـەژن و یـادو بۆنەکانو هەڵسـەنگاندنێك | چـاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٨٢ | سروودو مۆسیقاو چـەند بابەتێکـی هونـەریی لەبەر ڕۆشــنایی قورئـانو سـوننەتـدا | چاپی یەك/٢٠٠٩ چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمـانی فارسـییش تەرجەمـە کــراوە |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ٨٣ | چەند بنەمایەکی گرنگی ماڵو سامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| | تەزکیەی نەفس و ڕەوشت و ئاکار | | |
| ٨٤ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |
| ٨٥ | ڕێگای صاڵح بوونو بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠ چاپی شەش/٢٠٢١ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبیو فارسییش |
| ٨٦ | تەزکیەو تەبایی‌و، یەکریزیی‌و برایی | چاپی یەك/١٩٩٨ | |
| ٨٧ | مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |
| ٨٨ | گەڕانەوە بۆ لای خوا (سبحانە وتعالی)، بەرەو خوا وەرچەرخانو، وازهێنان لە گوناهو سەرپێچیی‌و، گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١ چاپی شەش/٢٠٢١ | |
| ٨٩ | شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ٩٠ | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزنەوە، لەدنیاو دوارۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٩١ | گیانی ژیـان: باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك كردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٩٢ | مەوســـووعەی: ڕەوشتو ئاكاری ئیســـلامیی لەبەر ڕۆشـــنایی قورئانو ســوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٩٣ | ئەدەبو ڕەوشتە كۆمەڵایەتییەكان لەبەر ڕۆشنایی وەحییو عەقڵدا | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| | بانگـەوازو كـاری ئیســـلامیی | | |
| ٩٤ | كۆمەڵـی خـــوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٩٥ | پێشمەرگەی ئیســلام، یان مســـوڵمانی موجاهید كێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨ چاپی چوار/٢٠٢٠ | |
| ٩٦ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیســلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٩٧ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| ٩٨ | بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مانو نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٥ | |
| ٩٩ | هەڵسەنگاندنو هەڵوێستمان لەم قۆناغەدا | چاپی یەك/١٩٩٥ | |
| ١٠٠ | تێگەیشتن | چاپی یەك/ ١٩٩٦ | |
| ١٠١ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەكانی كوردستان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| ١٠٢ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەكی گەشو ڕوون، بنەما شەرعییەكان و بنچینە ئەخلاقییەكان | چاپی یەك/ ١٩٩٧ | |
| ١٠٣ | ئیسلامو كێشە هەنووكەییەكان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ١٠٤ | زانایانی ئیسلام كێنو چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ١٠٥ | كۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانجو هەڵوێستەكانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٠٦ | هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی داو، چەند ئامۆژگارییەك بۆ ئەندام و موجاهیدانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ١٠٧ | چۆن لە جیهاد تێبگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ١٠٨ | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنجو ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ١٠٩ | جیهاد لەڕێی خوادا/ بۆ ئەوەی بەهەڵە لەجیهاد تێنەگەین‌و لەسەر جەنگ کردنمان قەرزدار نەبینەوە | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ١١٠ | جیهاد لە ڕێی خوادا چییەو بۆچی دەکرێ‌و چۆن دەکرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ١١١ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك‌و برایانمان لە هەندەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ١١٢ | ئیسلام‌و مسوڵمانەتیی‌و کاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |
| ١١٣ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١١٤ | بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩ چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەکەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز کراوە، بەم شێوەیە: ئاڵقەی یەکەم: بەڵگەکانی ئەوانەی بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان. ئاڵقەی دووەم : بەڵگەکانی ڕەوایی بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |
| ١١٥ | هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەرگیرانەکانی ڕێکخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥ چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ١١٦ | با لادان و تاوانی پەرگیران، بەرانبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان | چاپی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١١٧ | پەڕگیریی: پێناسەی، نیشانەکانی پەڕگیران، هۆکارەکانی پەڕگیریی، شوێنەوارو دەرهاویشتەکانی، چارەسەری | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| ١١٨ | هەڵوەشاندنەوەی پەڕگیریی | چاپی دوو/ ٢٠١٨ | کۆی سێ نامیلکەی پێشووە |
| ١١٩ | بەرەو بانگەوازێکی ڕاستو ڕەسەن | چاپی یەك/٢٠١٩ چاپی دوو/٢٠٢١ | دواتر خرایە نێو زنجیرەی: بەرەو باشتر تێگەیشتنو پێگەیشتن |
| ١٢٠ | هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٩ چاپی دوو/٢٠٢١ | دواتر خرایە نێو زنجیرەی: بەرەو باشتر تێگەیشتنو پێگەیشتن |
| ١٢١ | کێ شایستەی مینبەرو میحرابە؟ | چاپی یەك/ ٢٠٢٠ | |
| بنەما شەرعییەکانی کارو چالاکیی ڕێکخراوەیی و حیزبیی | | | |
| ١٢٢ | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٢٣ | ئاڵقەی دووەمو سێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەستانی مسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ١٢٤ | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبوو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبیی |
| ١٢٥ | چۆن گەشە بە کۆمەڵی ئیسلامیی بدەین؟ | چاپی یەك / ٢٠٢٠ | |
| | وتاری کۆنگرەکانی کۆمەڵی دادگەریی کوردستان | | |
| ١٢٦ | کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥ چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ١٢٧ | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان (وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٢٨ | چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمانو واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ١٢٩ | وتاری فیکرییو سیاسیی کۆمەڵی دادگەریی کوردستان/ ٢٠٢١/٢/١٨ | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| | نەتەوایەتیی و مەسەلەی کورد | | |
| ١٣٠ | کوردستان بۆ وێران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ١٣١ | مەسەلەی کورد چییەو چۆنو بەچی چارەسەر دەکرێ؟ | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ١٣٢ | حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠ چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ١٣٣ | سۆزی نەتەوایەتییو بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠ چاپی چوار/٢٠١٨ | وەرگێرردراوەتە سەر زمانی فارسیی |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٣٤ | چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمانو پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| ١٣٥ | چەند ڕێنموویيەك بۆ حاڵەتی ئیسلامیی لە کوردستاندا | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ١٣٦ | جەژنی قوربانو جەنگی قەڵاتووکان | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| | سیاسەت و حوکمرانیی | | |
| ١٣٧ | چەند بابەتێکی سیاسیی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | مەوسووعەی: ئیسلامو دەوڵەتداریی، (٤ بەرگ) | چاپی یەك / ٢٠١٤ | |
| ١٣٨ | بەرگی یەکەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەکانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشتو بناغەی فیکریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواروچـاپ | تێبـینـی |
|---|---|---|---|
| ١٣٩ | بەرگی دووەم:<br>بنەمایەکانی سیستمی<br>حوکمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ١٤٠ | بەرگی سێیەم: (سێ<br>دەستەڵاتەکان):<br>یاسادانان<br>جێبەجێکردن<br>دادوەریی | | |
| ١٤١ | بەرگی چوارەم: نا<br>مسوڵمانان لە کۆمەڵگاو<br>دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ١٤٢ | ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ<br>واقیعی ئێستامان | چاپی<br>یەك/٢٠٠٩<br>چاپی<br>دوو/٢٠١٧ | |
| ١٤٣ | قورئانو پاکسازییو<br>چاکسازیی لە هەرێمی<br>کوردستاندا | چاپی<br>یەك/٢٠١٨ | |
| ١٤٤ | گرنگیی ڕەوشت<br>لەسیاسەتدا | چاپی<br>یەك/ ٢٠١٩<br>چاپی<br>سێ/٢٠٢١ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چـاپ | تێـبـیـنـی |
|---|---|---|---|
| ١٤٥ | واقیعی دژواری ئۆممەت: هۆکارو چارەسەر | چاپی یەك/٢٠٢٠ چاپی دوو/٢٠٢١ | دواتر خرایە نێو زنجیرەی: بەرەو باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن |
| ١٤٦ | سەرکردایەتیی کردن لەئیسلامدا چیەو چۆنە؟! | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| | ئافرەت و خێزان | | |
| ١٤٧ | ئافرەتی مسـوڵمانی کورد، مافە شەرعییەکانی‌و ئەرکە گرنگەکانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣ چاپی دوو/ ٢٠٠٣ | |
| ١٤٨ | مەوسـووعەی : ئـافرەت‌و خێزان لە سـایەی شــەریعـەتدا | بەرگی یەکەم چاپی یەك/٢٠٠٢ بەرگی یەك‌و دوو چـاپی سێ/٢٠١٣ | |
| | مـێـــژوو | | |
| ١٤٩ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەرس‌و پەندەکانی | چاپی یەك/٢٠٠٩ چاپی سێ/٢٠١٣ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چـاپ | تێـبـینـی |
|---|---|---|---|
| ١٥٠ | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەکانم)، بەشی یەکەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١٥١ | بەرکوڵێکی کاروچالاکیی و ڕووداوەکانی ژیانم (١٩٦١-٢٠١٧) | چاپی یەك/٢٠١٨ | بۆ هەردوو زمانی عەرەبیی و ئینگلیزیی وەرگێردراوە |
| دیدارو گفتوگۆ | | | |
| ١٥٢ | سـنووره قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسـین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١ چاپی دوو/٢٠٠٤ | |
| ١٥٣ | ئەشـکەنجــەو زیندان، پێشــمەرگەیەك بیسـتو دوو مانگ لە زینــدانی داگیـرکــەردا | چاپی یەك ٢٠٠٥ / چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سـەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسـیشی کراوەو چـاپو بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگـلیزیش وەرگێڕراوە |
| ١٥٤ | گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا | چاپی یەك ٢٠١٠/ | |
| ١٥٥ | گفتوگۆیەك لەگەڵ بابمدا | چاپی یەك ٢٠٢١ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان | | |
| ١٥٤ | گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٥٥ | با وریا بین ! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢ چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ١٥٦ | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٥٧ | چۆنیەتی بوونە پێشەنگو بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٥٨ | سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٥٩ | چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٦٠ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنجو ڕێنماییەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چـاپ | تێبـینـی |
|---|---|---|---|
| ١٦١ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سـەنگی مەحەکی مسـوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٦٢ | بانگەواز بۆ لای خودا چییەو چۆنەو بەکێ دەکرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسـییش وەرگێڕراوە |
| ١٦٣ | قوتابیان لەم هەلو مەرجەدا، پێویســـتە چۆن بن‌و چی بکەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٦٤ | واقیعی هەرێمی کوردسـتان، دیدێکی ئیســـلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٦٥ | ســـروشـت‌و پایەکانی خێزان‌و مەسـەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع‌و عـەقڵــدا (١٢) | چـاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلکـەیە بە(١٤) ئاڵقـە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ١٦٦ | کاری ئیسـلامیی‌و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێـك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٦٧ | حوکمی لە ئیســـلام هەڵگەڕانەوەو هەڵســـەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٦٨ | مەلای گەورەی کۆیەو تەفسیرەکەی‌و چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٦٩ | لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی: هەبوون‌و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٧٠ | تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چییەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣ چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١٧١ | ڕەوەندی کورد لە هەندەران‌و ئەرکی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٧٢ | خاتوون مەلاژن: ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٧٣ | گەنج‌و قەیرانی ڕووحیی: هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١٧٤ | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەکان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ١٧٥ | قورئانو سوننەت وەك ڕووحو جەستە تێکهەڵکێشن (٢٢) | چاپی یەك/٢٠٢٢ | |
| ١٧٦ | گەنج و هەست و هەڵوێست (٢٣) | چاپی یەك/٢٠٢٣ | |
| ب/کتێبە عەرەبییەکان | | | |
| | موسوعة : الإسـلام كما يتجلّى في كتاب الله | ط الاولى/٢٠١٥ | سەرجەم بەرگەکان کارکردن تێیدا بەردەوامە بۆ تەرجەمەکردنی بۆ سەر هەردوو زمانی تورکییو فارسیی |
| | کە لە چاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: | | |
| ١٧٧ | الكتاب الأول: الإسـلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلق | ط الثانية/٢٠١٦ | بۆ هەردوو زمانی تورکییو فارسیی وەرگێڕدراوە |
| ١٧٨ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط االثانية/٢٠١٧ | بۆ هەردوو زمانی تورکییو فارسیی وەرگێڕدراوە |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٧٩ | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | بۆ هەردوو زمانی توركییو فارسیی وەرگێڕدراوە |
| ١٨٠ | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | ط الثانية/٢٠١٧ | بۆ هەردوو زمانی توركییو فارسیی وەرگێڕدراوە |
| ١٨١ | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٨٢ | الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٨٣ | الكتاب السابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوّته | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٨٤ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٨٥ | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | ط الثانية/٢٠١٨ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٨٦ | الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى | ط الثانية/٢٠١٩ | |
| ١٨٧ | الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام | ط الثانية/٢٠٢٠ | |
| ١٨٨ | الكتاب الثاني عشر: الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم | ط الثانية/٢٠٢٠ | |
| ١٨٩ | نقض فكرة التطرف | ط الاولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين) | ترجم إلى اللغات: الفارسية والإنجليزية والتركية |
| ١٩٠ | ضيف و قضية (مقابلة مع قناة العربية) | ط الاولى/٢٠٠٦ | |
| ١٩١ | لقاء خاص (مقابلة مع قناة العالم) | ط الاولى/٢٠٠٦ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٩٢ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الاولى ٢٠١٦/ | |
| ١٩٣ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الاولى/٢٠١٢ | |
| ١٩٤ | أمير وراء القضبان | ط الاولى/ ٢٠٠٩ ط الثاني/٢٠١٣ | |
| ١٩٥ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| ١٩٦ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الاولى/ ٢٠١١ | |
| ١٩٧ | علماء الإسلام: أوصافهم النَّبيلة، وظائفهم الثقيلة، مواقفهم الجليلة | ط الاولى/ ٢٠٠٥ ط الثالثة/ ٢٠٢٠ | |
| ١٩٨ | الأُصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/٢٠٠١ ط الثالثة/ ٢٠١٢ | |
| ١٩٩ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٢٠٠ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الاولى والثانية/٢٠١٨ | |
| ٢٠١ | الديموقراطية والعلمانية في تجربة كوردستان | ط الأولى /٢٠١٧ | |
| ٢٠٢ | خلاصة أحداث حياتي ونشاطاتي الفكرية والسياسية (١٩٦١-٢٠١٧) | ط الأولى /٢٠١٨ | |
| ٢٠٣ | نظرات فاحصة في قضايا شاخصة: الإسلام والأُمة، القضية الكوردية، الوضع العراقي | ط الأولى /٢٠١٨ | |
| ئەو کتێبانەی لەژێر چاپن | | | |
| ٢٠٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز/: تاکو سوورەتی: (الناس) خوا پشتیوان بێ کارکردن تێیدا بەردەوام دەبێ تاکو هەمووی چاپ دەکرێ | | |

# نێوەڕۆك

# گەنج و هەست و هەڵوێست

ئەم کتێبە

لەبارەی گەنجو لاوانەوە دەدوێ، لەڕووی:

١-پێناسەی گەنجو لاو و تایبەتمەندییەکانیانەوە.

٢-گرنگیی توێژی گەنجو لاوانو هەستیاریی ڕۆڵیان و گەورەیی کاریگەرییان لە مێژووداو، لەواقیعی ئێستای کۆمەڵگاکانیشدا.

٣-هەستو بیرو بۆچوونو تێڕوانینیان.

٤-هەڵوێستو ئاکارو کرداری پڕبەپێستی هەست و تێڕوانینیان.

٥-دەردو نەخۆشییو گرفتو کێشە بنەڕەتییەکانی گەنج و لاوانی هەرێمی کوردستان.

٦-چۆنیەتی ڕووبەڕوو بوونەوەو چارەسەری ئەو گرفتو کێشەو دەردو نەخۆشییانە، لەلایەن خودی گەنجو لاوانو، لایەنە پەیوەندیدارەکانی فەوارەی سیاسیی هەرێمەوە.

 www.alibapir.net

 /alibapir1

 /alibapir



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

 /TafseerOffice

+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

نرخی 3.000 دینار



9 789922 679013